

# نوور

ئامادەکردنی: گۆنا محێدین محەممەد

پێداچوونەوەی: م. شێخ محێدین قەرەداغی

# ژیانی خانمانی باوەڕدار



ناوی کتێب : نوور

(ژیانی خانمانی باوەڕدار)

ئامادەکردنی : گۆنا محێدین محمد

پێداچوونەوەی : شێخ محێدین قەرەداغی

دیزاین : عیماد عبدالقادر

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نۆبەی چاپ: یەکەم

ژمارەی سپاردنی (١٢٣٦)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی دراوەتێ

# بەناوی خواوەندی تاك و تەنیا

## پێشەكی :

بەهەزاران دروودو ڕەحمەت بۆگیانی ئازیزمان حەزرەتی محمد ﷺ ، وە بۆ گیانی پاکیزەیی سەرجەم چاکانی ڕێگای پیرۆز بەتایبەت خاتونانی بەئەمەك و هەناسە تولانی کە مێژوویان شانبەشانی مێژووی پیاوانی پایەدار لەسەر لاپەڕەکانی ژیان بەنەمری ئەدرەوشێنەوە .

مانگی ڕەمەزانی پیرۆز یەکێکە لەو مەوسیمە ئیمانیانەی کە نازی بەرماڵ و سوجدە و نزاو پاڕانەوە خەویان لە هەموو ساتێکی ئەم ماهە زڕاندووە و دەنگی قورئان و سەلاو تەزبیح وتەراویح هەموو هەستێکیان بەتاسەوە خرۆشاندووە لەم مانگەدا سەرجەم ماڵ وجێگا و مزگەوت و دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەتایبەت ئیسلامییەکان بەگرنگییەکی زۆرەوە لەپێشوازی دان، دەنگی یەکگرتوو ڕادێوی سلێمانی هەموو ساڵێ پێش هاتنی ئەم مانگە پیرۆزە چەند دانیشتنێك دەکات بۆ بەرنامەڕێژیی ئەم مانگە پیرۆزە، ئەوە بوو بۆ مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٢٠٠٧ دانیشتنێکمان کرد بۆ ئەوەی بزانین بەرنامەمان چیبێت بۆمانگی ڕەمەزان. برای بەڕێزم کاك شێخ فاتیح پێشنیاری ئەوەی بۆکردم کە بەرنامەیەك ئامادەکەم تایبەتبێت بەخانمانی سەرمەشق و باوەڕدار، منیش زۆرم پێ باش بوو. پاشان برای بەڕێزم کاك تاریق هاوکاریکردم بۆ کۆکردنەوەی هەندێ سەرچاوە بەزمانی عەرەبی لەڕێی ئینتەرنێتەوە. دوای پەیداکردنی سەرچاوەی زۆرو ئامادەکردنی، بەسەرپەرشتی باوکی ئازیزم (مامۆستا شێخ محی‌الدین) کردمان بەکوردی و دامان ڕشتەوە بەشێوەی چیرۆك، و سود وەرگرتنە لەهەندێ تەفسیری قورئان پاشان باوکم پیاداچوونەوەیەکی

وردودرشتی بۆ کردم. دابەشم کرد بۆ (٣٠) زنجیرە و ناوم نا بەرنامەی (نوور). بۆیە نوور لەبەرئەوەی (سورەتی نور) لەقورئانی پیرۆزدا باسی هەندێ لەڕۆڵ و تایبەتمەندی خانمانی باوەڕدەکات. هەموو ڕۆژێك ئەڵقەیەکی دادەبەزی لەشێوەی چیرۆکدا، باسی ئەوخانمانەمان دەکرد کەلەدایکە حەواوە تا خانمانی میللەتی خۆمان کە چۆن جوامێرانەو چاونەترسانە باوەڕی خۆیان پاراستووەو تا ئێستا ناویان بەنەمری ماوەتەوە. سوپاس بۆ خوا بەرنامەیەکی باش بوو، زۆرێك لەگوێگران بەدڵیان بوو بەو ئومێدەی پەروەردگار ڕەزامەند بووبێ، پاشان بۆسالی (٢٠٠٨) بڕیارماندا بەردەوام بین لەسەر ئەو بەرنامەیە، هەندێك زنجیرەی ترمان ئامادەکرد سوپاس بۆ خوا بەسەرکەوتوویی پێشکەشمان کرد، پاشان بڕیارماندا بیکەینە کتێبێك و بڵاوی بکەینەوە، جارێکی تر باوکی ئازیزم پیاداچوونەوەیەکی تری بۆ کردم، بەڵام لەبەرئەوەی ویستم هەندیك لەخانمانی پێش هاتنی حەزرەتی ئازیز ﷺ بەجیا بڵاوبکەمەوە و بیکەم بەدوو بەشەوە پێش پێغەمبەرو دوای پێغەمبەر ﷺ . تەنها ئەمەی لەبەردەستی تۆی ئازیزدایە ئامادەم کرد بۆ بڵاوکردنەوە. بەو هیوایەی پەروەردگاری میهرەبان لێمان وەرگرێ، ببێتە تێشووی ڕۆژی دوایی بۆخۆم و سەرجەم ئەوانەی کە هاوکارییان کردم بەتایبەت باوکی ئازیزو بەڕێزم. بەدڵی تۆی خۆشەویستیش بێت، سوپاس بۆ دەنگی یەکگرتوو ڕادیۆی سلێمانیش کە تیایدا گەورەبووم و پەروەردە بووم. لەدواییدا لەپەروەردگار دەپاڕێمەوە کە شوێنی ئەوخانمانە لەبەهەشتا بەرزترین جێگا بێت و لەدنیاش دا چرای ئەمرییان هەردەم بەبلێسە بێت و نمونەیان تا ڕۆژی دوایی لەزیادبووندا بێت .

(١)

# ژیانی دایکی هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی

# دایکە حەوا

بۆ هەڵدانەوەی یەکەمین لاپەڕەی ژیانی خانمانی باوەڕدارو ناودارو پایەدار لەدونیاو قیامەتدا، ئەچینە خزمەت چیرۆکی ژیانی یەکەمین خانم، و دایکی هەموو مرۆڤەکانی دونیا، دایکە گەورەی مرۆڤەکان دایکە حەوا...

کاتێ خوای باڵادەست ئیرادەی فەرموو کە زەوی ئاوەدان بکاتەوە بەمرۆڤ، و پاشان بیانکاتە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی و خواپەرستی بکەن، کاری چاکەو چاکەخوازیی لەسەر زەوی بڵاوبکەنەوە، باوکە ئادەم باوکی هەموو مرۆڤەکانی سەر ڕووی زەمینی دروستکردو پاشان ڕۆحی کرد بەبەریدا، لەدواییدا فەرمانیکرد بەفریشتەکان کە کڕنوشی بۆبەرن، ئەوەبوو هەموو کڕنوشیان بۆ برد بێجگە لەشەیتان، واتە شەیتان کڕنوشی بۆ ئادەم نەبرد لەبەر گومڕاییو خۆبەگەورەزانینییەوە، کەئەم لەنور دروستکراوەو ئادەمیش لەخۆڵ دروستکراوە چۆن کڕنوشی بۆ ئەبات، لێرەدا شەیتان سەرپێچی فەرمانی خوای کرد، خوایش بەهۆی ئەو سەرپێچییەیەوە لەڕەحمی خۆی بێ بەشیکرد، شەیتانیش لەغەشم وقینی ئەوەی کە خوا لەسەر ئادەم لەڕەحم و بەزەیی خۆی دووری خستەوە داوای کرد لەپەروەردگار کە مۆڵەتی بداتێ تا ڕۆژی

دوایی. ئەوە بوو پەروەردگاریش داواکەی قبولکرد، پاشان شەیتان بڕیاری دا ببێ بەدوژمنی هەتاهەتایەی ئادەم و ئەوەی لەو ئەبێت، ئەوە بوو (ئادەم) باوکی هەموو مرۆڤەکانی دونیا بەتەنیا لەنێوان هەموو درەختەکانی بەهەشتداو لەژێر سێبەری درەختەکانیدا ژیانی ئەگوزەراند پەروەردگاریش ویستی وابووکە هاوەڵ و هاودەمێکی بۆ دروستبکات و لەوتەنیاییە ڕزگاری ببێت، لەکاتێکدا حەزرەتی ئادەم خەوی لێکەوتبوو، پەروەردگاری بەدیهێنەر دایکە حەوای لەپەراسوی چەپی حەزرەتی ئادەم دروستکردو لەلایەوە دانیشت. کاتێ ئادەم خەبەری بوویەوە سەرسام بوو نەیزانی ئەمە کێیەو چییە، لێی پرسی: تۆ چیت و چی دەکەی لێرە؟ حەوا وەلآمی دایەوە وتی: من ژنم و بۆ هاوسەر و هاودەمیی تۆ دروستکراوم. ئادەم زۆر دڵی خۆش بوو و زۆر بەختەوەر بوو پێی. پێکەوە ژیانیان ئەگوزەراند، چۆن ژیانێ! ژیانێکی زۆر جوان وخۆش ئەژیان لەناو بەهەشتدا، و لەناو ئەو هەموو خۆشییەی بەهەشتدا ئەژیان. کاتێ فریشتەکان پرسیاری ناوی (حەوایان) کرد، پەروەردگار فەرموی: بۆیە (حەوا) چونکە لەزیندوو دروستکراوە و هەموو نەوەیەك تا ڕۆژی دوایی لەو دووانە دروست دەبێ، حەوا دیارییەکی خوا بوو بەخشیە ئادەم. پەروەردگار پێی فەرموو: خۆت و خێزانت لەبەهەشت جێگیربن و لەهەموو نازو نیعمەتەکانی بەهەشت بخۆن و بخۆنەوە و لەزەتی لێوەرگرن بێجگە لەو درەختە. دیارە درەختەکەی بۆ دیاریکردن کە چ درەختێکە کە نابێ لێی بخۆن و لێی نزیك نەبنەوە قەدەغەیە بۆتان، وە ئەو درەختەش خوا خۆی ئەزانێ چ درەختێکە، چونکە نە لەقورئاندا نە لەفەرموودەدا ناوی نەهاتووە، بەلاّم هەندێ لەزانایان ئەڵێن: ئەو درەختە گەنمە، هەندێکی تر ئەڵێن: مێوە، و هەندێکی تر ئەڵێن: خورمایە. پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـــذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِينَ﴾البقرة:٣٥. دایکە حەوا ژیانی لەگەڵ باوکە ئادەم زۆر بەکامەرانی وخۆشگوزەرانی و ئاسودەیی دەبردەسەر. لەزەتیان لەهەموو نازو نیعمەتەکانی ناو

بەهەشت و ئەوەی خوا پێی بەخشیبوون. لەسەر پەیمانەکەی خوا مانەوەو لەبەری ئەو درەختەیان نەدەخوارد کە خوا قەدەغەیکردبوو لێیان، بەڵام شەیتان کە لەسەر کڕنوش بردن بۆ ئادەم خوا لەسۆزو بەزەیی خۆی بێبەشی کردبوو، چۆن واز دێنێ ئادەم و حەوا بەئاسودەیی بژین. وە خۆیشی پەیمانی داوە کە نابێ وازبێنێ تا ڕۆژی دوایی دژایەتی ئادەم دەکات و ئەوەیشی لەو دەبێ دووریان دەخاتەوە لە خواپەرستی و لەڕەحم و سۆزی پەروەردگار، بێگومان هەرگیز ئاسودە نابێ دوژمنەکانی لەئاسودەییدا بژین، و ئەویش دەربەدەرو سەرگەردان لەدەرەوەی بەهەشت بژی. شەیتان بەهەمیشەیی چاودێری ئادەم و حەوای دەکرد لە هەڵسوکەوت و خۆشگوزەرانییان، هەموو کات هەوڵی دەدا فێڵێك پلانێك بدۆزێتەوە بۆئەوەی دووریان بخاتەوە لەڕەحم و سۆزی پەروەردگار، ئەوەبوو ڕێگایەکی دۆزییەوە بۆئەوەی تووشی تاوانێکیان بکات و پەروەردگار لێیان برەنجێ و دووریان بخاتەوە لەو بەهەشتە خۆشە. پلانەکەی ئەوەبوو کە قەناعەتیان پێبکات کە لەبەری ئەو درەختە بخۆن کە خوا لێی قەدەغەکردون نەیخۆن. فێڵەکەی دۆزییەوە. کەوتە جوانکردن و ڕازاندنەوەی ئەو درەختەو بەتامکردن و خۆشکردنی بەرەکەی لای ئادەم و حەوا، بەشێوەیەکی وا قەناعەتی پێکردن کە بەخواردنی بەری ئەو درەختە بۆ هەتاهەتایە لەبەهەشت ئەمێننەوە، دەستی کرد بەفێڵەکەی بەوەسوەسە دروستکردن لەدڵیاندا، بەوە دەستی پێکرد کە ڕووت بکرێنەوە لەو جلەی کە لەبەریاندابوو، چونکە ئەوان زۆر شەرمیاندەکرد بەدەرکەوتنی لاشەیان. شەیتان پێی وتن: بۆچی لەبەری ئەو درەختە ناخۆن؟ وتیان: خوا لێی قەدەغەکردووین. ئەویش وتی: بۆیە لێی قەدەغەکردون لەبەرئەوەی ئەوەی لەودرەختە بخوات دەبێ بەفریشتە بۆ هەتاهەتایە، سوێندی بۆخواردن کە من ئامۆژگاریتان دەکەم و زۆر ڕاستگۆم لەگەڵتاندا: ﴿وَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَاتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا

مِنَ الْخَالِدِينَ وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ ﴾الأعراف: ٢٠-٢١

بەو شێوەیە خواردنی ئەوبەرەی کە قەدەغە کرابوو لێیان، جوان و ڕازاوەی کرد لەلایان، سوێندیشی بۆ خواردن کە ڕاستگۆیە لەگەڵیانداو دڵسۆزیانە، فریوی دان و لەو درەختەیان خوارد و لە فەرمانی خوا دەرچوون. دەست بەجێ گیانیان دەرکەوت کە بەوەش فریودران وایان ئەزانێ نابێ سوێند بەخوا بەدرۆ بخورێ، کاتێ سوێندی بۆ خواردن باوەڕیان پێکرد. زۆر شەرم بوو لایان، خێرا چوون لەگەڵای داری بەهەشت خۆیان داپۆشی. لۆمەی خوا هاتە سەریان و زۆر پەشیمان بوونەوە لەوەی کە بەگوێی شەیتانیان کردو فریویان خوارد بەدەستی شەیتان: ﴿فَدَلاَّهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَا إِنَّ الشَّيْطَآنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾ الأعراف:٢٢. تا لێرەدا ئادەم و حەوا زانیان کە شەیتان فێڵی لێکردون و هەڵی خەڵەتاندون. پەشیمانی دایگرتن و زۆر غەمباربوون لەسەر ئەوەی ئەو سەرپێچییەی کە دەرهەق بە پەروەردگار کردیان .

ئەی باشە ئێستا چیبکەن تاخوا لەخۆیان ڕازیبکەن و بیانبەخشێت لەوتاوانەی کە شەیتان پێی کردن بەرامبەر بەبەڵێنی پەروەردگار. پاش ئەوەی لەبەهەشت فرێدرانە سەرزەوی زۆرگریان و هاواریان کرد کە خوا بەمیهرەبانی خۆی بیانبەخشێت لەو تاوانەی کردیان. خوای گەورە خستیە دڵیانەوە کە بپاڕێنەوەو داوای لێخۆشبوون بکەن کە خوای گەورە میهرەبانە و لەهەموو تاوانێك خۆش ئەبێت ئەگەر داوای لێخۆشبوون بکەیت: ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾البقرة٣٧

ئەم وشانەش ئەمانە بوون: ﴿قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾الأعراف:٢٣. خوای گەورە فرێیدانە سەرزەوی لەگەڵ کۆمەڵێ بونەوەری تردا: ﴿فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ ﴾البقرة/٣٦، ئا ئێرەوە ژیان لەسەر زەوی دەستی پێکرد و جەنگی نێوان مرۆڤ و شەیتان بەرپابوو چونکە بڕیاری خوا بوو کە بەئادەم و حەوا زەوی ئاوەدان بکەنەوە .

وە لەئادەم و حەوا نەوەی زۆر ببێت و زەوی ئاوەدان بکەنەوە و زانست و زانیاری و چۆنیەتی ژیان فێربن، وە خوای گەورە نامەی ئاسمانی لەلایەن خۆیەوە بۆناردن کەوا خواپەرستی بکەن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکەن و هەر ئەو بەخوا بزانن ، چونکە هەر ئەو شایستەی پەرستنە .

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً ﴾النساء/١

ئا بەم شێوەیە دایکە حەوا لەگەڵ هاوسەرەکەی ژیانێکی ئارام و جوانی بەسەربرد. هەمیشە گوێڕایەڵی پەروەردگار و هاوسەرەکەی دەکرد. منداڵەکانی شان بەشانی مێردەکەی پەروەردە دەکردو ئامۆژگاری دەکردن لەسەر خواپەرستی و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی پەروەردگار.

تا ڕۆژی دوایی چی نەوەیەك لەدایك دەبێت لەنەوەی حەواو ئادەمە. خوای گەورە بۆیە مرۆڤی دروستکرد بۆ ئەوەی خواپەرستی بکەن بەپەرستنێکی شیاو و گونجاو: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾الذاريات:٥٦، هەندێ کەس پێیان وایە خواردنی درەختەکەی بەهەشت خەتای دایکە حەوابووە کە گوایە ئەو زوو فریوی خواردووە بەقسەی شەیتان، ئەویش داوای کرد لەباوکە ئادەم، کە ئیتر هەردووکیان

دووچاری نارەحەتی و سەرپیچی پەروەردگار هاتن و دووركەوتنەوە لەبەهەشت، هەتا هەندێك بێئاگا لەوەیش دەڵێن هەركەس لەم سەرزەویە تاوان بكات دەیخەنە ئەستۆی ئەو، بێگومان ئەمە بۆچوونێكی بەتاڵ و بێمانایە دوورە لەڕاستییەوە دوورە لەفەرمودەی خواو پێغەمبەرەكەیەوە، چونكە ئایەتەكە بە وشەی (مُپنی) واتە بەدووان ناویان ئەبات ئەفەرموێ (فازلهماالشیطان عنها) {فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ}الأعراف:٢٠ {فلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ}الأعراف:٢٢ هەزاران درووود و ڕەحمەت لە دایكە حەوا گەورە خاتونی هەموو جیهان .

(٢)

## خاتوو سارا

## ( خێزانی باوکی پێغەمبەران
## حەزرەتی ئیبراهیم (علیە السلام) )

ڕۆشت و کۆچی کرد لەپێناو ئاینی پیرۆزی ئاسمان لەگەڵ هاوسەرەکەی و برازای مێردەکەی (لوط) پێغەمبەر سەلامی خوایان لەسەربێت ڕۆشتن بۆ فەلەستین ، بەڵام کاتێ قات و قڕی و وشکە ساڵیی ڕوویکردە فەلەستین کۆچیانکردەوە بەرەو میصر. لەوسەردەمەدا پاشایەك لەفیرعەونەکان بەدڕەوشت و ناپاك حوکمڕانی میصری دەکرد، هەر ژنێك جوان بووایە بچوایەتە میصر، ئەبوایە بیانبردایە بۆ فیرعەون و لەگەڵیدا ڕایبواردایە .

فیرعەون سەرباز و پیاوانی خۆی بلاّوکردەوە لەناو شاردا بۆئەوەی چاودێریی ناو شاربکەن تا بزانن چ ژنێك جوان و ڕێبوارە بیگرن و بیبەن بۆ فیرعەون تا لەگەڵیدا ڕابوێرێ ، ئا لەم کاتەدا ساراخان و حەزرەتی ئیبراهیم گەیشتنە میصر. سەربازەکانی فیرعەون زانیان یەکسەر هەواڵی گەیشتنی ژنێکی جوانیان دایە فیرعەون. کاتێ حەزرەتی ئیبراهیم بەمەی زانی بەسارای وت: ئەگەر پرسیاریان لێکردی چی ئەو

پیاوەیت؟ بلێ: من خوشکی ئەو پیاوەم ئەگەر بڵێی من ژنی ئەو پیاوەم دەستت بۆ درێژ دەکات، چونکە ئەو داوێن پیسە و زیاتر مەبەستی شکاندنی ناموسی کەسانی خاوەن پلەو پایە و نەفس بەرزە. وە حەزرەتی ئیبراهیم کە وتی بڵێ خوشکمە واتە خوشکی ئیمانیی، چونکە ئیمانداران هەموو خوشك و برای یەکترن. بەساراخانی وت: من لەم دنیایەدا کەس شکنابەم باوەڕدار بێجگە لەمن و تۆو لوطی برازام کەوابوو من وتۆ خوشك و برای ئیمانیین .

پاشان فیرعەون داوای کرد کە ئەو ژنەی بۆ بەرن و بۆی ئامادەبکەن کاتێ ساراخان گەشتە کۆشکی فیرعەون لەوکاتەدا دەست نوێژی گرت و نوێژی کردو زۆر لەخوا پاڕایەوە تا بیپارێزێ لەو ناپاکە. فەرمووی: ئەی خوای گەورەم من لەبەرخاتری تۆ و پێغەمبەرەکەت هەمیشە ناموس و شەرەفی خۆمم پاراستووە وە باوەڕم بەتۆ و پێغەمبەرەکەت هێناوە، داوات لێدەکەم ئەم پیاوە داوێنپیسە زاڵ نەبێ بەسەرمدا و بم پارێزێ. پەروەردگاری بەبەزەیی دوعاکەی قبولکرد .

کاتێ فیرعەون ویستی دەست درێژی بۆبکات هەردوو دەستی وشك بوو، زانی کە لەبەرپاکی ئەو ژنە وای لێهات. پێی وت: دوعام بۆبکە با دەستم چاك ببێتەوە وازت لێدێنم. ساراخان دوعای بۆکرد. دەستی چاکبوویەوە، بەڵام دووبارە ویستی پەلاماری بدات، پەروەردگار جارێکی تر هەردوو دەستی وشك کردەوە. بۆجاری دووەم داوای لێکردەوە دوعای بۆبکاتەوە تا دەستی چاکببێتەوە، ساراخان دوعای بۆکردەوە دەستی چاکبوویەوە. بۆجاری سێیەم ویستی پەلاماری بداتەوە ئەمجارەش هەردوو دەستی وشکبوویەوە. فیرعەون بۆجاری سێیەم پێی وتەوە: تکائەکەم باوەڕکە ئەمجارە کۆتاجارە دوعام بۆ بکە دەستم چاکببێتەوە دڵنیابە دەستت بۆ درێژناکەم داوام بۆ بکە لەخواکەت کەچاکببمەوە، ساراخان ئەمجارەش دوعای بۆکردەوە دەستەکانی چاك بوویەوە. کاتێ فیرعەون ئەم موعجزەی بینی خێرا بانگی کرد لەسەربازەکانی پێی وتن: ئەم ئافرەتە لەگەڵ کێدابوو وەرن بیبەنەوە بۆلای پێی

وتن: ئەمەی بۆمنتان هێناوە مرۆڤ نییە فەرمانی دا کەنیزەکێکی لەگەڵدا بنێرن واتە کەنیزەکێکی پێبەخشی، ئەوکەنیزەکەش( هاجەرە) خاتوون بوو. بێگومان پەروەردگار مەبەستی هەبوو لەم کارە کە هاجەرە خان باوەڕبێنێت و ببێت بەدایکی حەزرەتی ئیسحاق پێغەمبەر و خێزانی ئیبراهیم پێغەمبەر، پاشان فیرعەون بەسەربازەکانی وت: وازیان لێبێنن بۆکوێ ئەچن با بچن. بۆجاری دووەم حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ سارا خاتوون و هاجەرە خاتوون گەڕانەوە بۆ فەلەستین، بەلاّم لەڕێگەدا (لوط) پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەربێت چوو بۆناو هۆزی (سەدووم و عەمورا) واتە (ئەردەن)ی ئێستا، بۆئەوەی بانگیان بکات بۆ خواپەرستیی و وازبێنن لەوکارە ناشرین و قێزەونانەی کە ئەیانکرد، ئاگاداریان بکاتەوە ئەگەر وازنەیەنن لەوکارە ناشرینانە ئەوا توشی سزای قورس دەبن لەدونیا و قیامەتدا .

ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆی ساراخاتون تەمەنی گەورەبوو منالّی نەئەبوو زۆر حەزیاندەکرد منالّێکیان ببێت و خۆیی و مێردەکەی دڵیان پێخۆشببێت و لەسایەیدا بحەوێنەوە، سارا هات بەدڵیا و بوو بە خوی سەری و خەو و ژیانی لێگۆڕا. ئەیویست هاجەرە بداتە حەزرەتی ئیبراهیم تا منالّێکیان ببێت، بەلاّم لەهەمان کاتدا بیری لەوە دەکردەوە ئەگەربێتو هاجەرە بدات بەمێردەکەی، ئەترسا لەوەی مەیلی زیاتر بدات بەو و مەیلی ئەم کەم بکاتەوە.

ڕۆژێکیان هاجەرە خاتون ئاوی هێنا بۆ ساراخان، ساراخاتون جارێکیتر بیری کەوتەوە کە هاجەرە بداتە حەزرەتی ئیبراهیم، بەلاّم وەك غیرەیەکی ژنانە هەر لەدڵەڕاوکێدا بوو. دەترسا سۆزی ئەم کەمکاتەوە، بەلاّم ئەم هاوردووبردەی دڵی زۆری خایاند، ئەوەبوو بڕیاریدا پاش چەند ڕۆژێك بەسەر ئەو وەسوەسەو دڵە ڕاوکێیەدا زاڵببێت، لەدڵی خۆیدا وتی: ئیبراهیم پێغەمبەری خوایە و ڕاستگۆو لەخواترسە هەرگیز شتی وا لەو ناوەشێتەوە، ئیتر تەواو دڵی ئارامی بۆ هات و دڵەڕاوکێی نەما. بڕیاری کۆتایی دا کەهاجەرە مارە بکات لەحەزرەتی ئیبراهیم، مارەی کردوو بووە

هاوســەری. پــاش مـاوەیــەك ســاراخاتون وردە وردە غــیرەی دروســتكرد بەرامبــەر هاجەرەخاتون، دەركەوت هاجەرە سكی هەیە، سارا غیرەكـەی زیـاتری كـرد، ئـەوەبوو هاجەرە منالّی بوو. كورێكیان بوو ناویان نا (ئیسماعیل)، بەلاّم سارا خـۆی پێنـەگیرا داوای لەحەزرەتی ئیبراهیم كرد كە هاجەرەو منالّەكەی دووربخاتەوە، دیـارە فـەرمانی خوا وابوو بۆ ئەوەی موعجیزەكانی و تاقیكردنەوەكانی بنوێنێ. دیارە فـەرمانی خـوا وابوو ئەبێ ساراخان غیرە بكاو داوای دوورخستنەوەی هاجەرەومنالّەكەی بكات. سارا ئەم بڕیارەی لەژێر دەستەلاّتی خۆیدا نەبوو، بەهەمان شێوە ئیبراهیمیش زۆر بەئاسانی تەسلیمی بڕیارەكەبوو وەك فەرمانێ لەلایەن خواوە بێ. حـەزرەتی ئیـبراهیم هاجـەرەو كۆرپەلە شیرەخۆرەكەی هەلّگرت و بەرەو زەوی (مەككـە) ڕۆیـی و لـەپالّ (بیــت الله الحرام)دا لەزەوییەكی وشك و بێ ئاو و بێ كشتوكالّ وگەرم و چۆلّ و بێناوەدانی بـەبێ قسە دانیان و بەجێی هێشـتن، بـەلاّم حـەزرەتی ئیـبراهیم سـپاردنی بـە پـەروەردگاری بەبەزەیی و خاوەن دەسەلاّت. لەوكاتەدا حەزرەتی ئیبراهیم لە پەروەردگار پاڕایەوە كە پـەروەردگار ئاگـاداری كۆرپەلـە شـیرەخۆرەكەیی و خێزانـە بەسـتەزمانەكەی بێـت و بیانپارێزێت لەهەموو خراپەیەك و خراپەكارییەك ونەشكەنجەو ئازارێـك. پاڕایـەوە لـە پــەروەردگار كـە ڕزق و ڕۆزی و هــاودەم و ئاوەدانیــان بــۆ بنێرێــت و لەنـەوەی ئـەوان پیاوچــاكان و پێغەمبــەران پەیــدابێت و خــوا بەتــەنها بپەرســتن و دوورنەكەونــەوە لەخواپەرستی و لەئاینی خوا ئەم دوعایەی كـرد:﴿رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِــوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْــوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُــمْ يَشْــكُرُونَ ﴾إبـراهيم:٣٧. وەك لەباسـی خـاتوو هاجەرەدا باسی دەكەین، بەلاّم نیشانەكانی دەستەلاّتی پەروەردگار كۆتاییان نایـەت و ویستی پەروەردگار وابوو كە نیشانەیەكی تری سەرسوڕهێنەر نیشان بدات.

ڕۆژێكیان كۆمەلّێك هاتن بۆ سـەردانیكردنی حەزرەتی ئیـبراهیم، حـەزرەتی ئیبراهیم زۆر ڕێزی لێگرتن، هات گوێرەكەیەكی قەلّەوی بـۆ برژانـدن و ئامـادەی كـرد

بۆیان تابیخۆن، پاشان فەرمووی لێکردن بەلاّم میوانەکانی نەیانخوارد، حەزرەتی ئیبراهیم لەم دیمەنە زۆر ترسا چونکە وا باوبووە ئەگەر میوان خواردنی خاوەن ماڵەکە نەخوات ئەوە نیازی خراپەی هەیە لەگەڵ ئەوماڵە.بەلاّم ئیبراهیم نەیزانی میوانەکان فریشتەن، فریشتەش نان ناخوات وە فریشتەکانیش لەشێوەی پیاوی بازرگاندا خۆیان بیشا ندا، بۆیە ئیبراهیم نەیزانی کە ئەوان فریشتەن، کاتێ خواردنەکەی بۆ دانان و ئەوانیش نەیانخوارد ئیبراهیم زۆرترسا، فریشتەکان زانیان حەزرەتی ئیبراهیم ترسا، پێیان وت: مەترسە ئێمە فریشتەین و لەلایەن پەروەردگارەوە هاتوین بچین بۆ وێرانکردنی گەلەکەی حەزرەتی (لوط) واتە برازاکەی حەزرەتی ئیبراهیم، پاش ئەوەی ئیبراهیم زانی کە ئەوان فریشتەن ئیتر ترسی نەما و داوای لێکردن کە هەڵنەسن بەوکارە، پێی وتن: وازیان لێبێنن بەڵکو باشبن و بێنە سەر ڕێگای ڕاست. چونکە ئیبراهیم کەسایەتیەکی زۆر لێبوردەو نەرم و نیان و ئارام بوو: ﴿وَلَقَدْ جَاءتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُواْ سَلاَماً قَالَ سَلاَمٌ فَمَا لَبِثَ أَن جَاء بِعِجْلٍ حَنِيذٍ فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لاَ تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُواْ لاَ تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ﴾هود:٧٠-٦٩. ئەوە بوو فریشتەکان هەواڵیان دا بە حەزرەتی ئیبراهیم کە ئەوان ئەچن بۆ وێرانکردنی گەلی لوط سلاّوی خوای لێبێت، چونکە ئەوان لایان داوە لە ڕێگای ڕاست و ڕێگەی نادروست و خراپ پەیڕەودەکەن.

سەرپێچی پێغەمبەرەکەیان ئەکەن و کاری ناشرین و بەدڕەوشتی ئەکەن بۆیە فەرمویان فەرمانەکە فەرمانی خوایە و گەڕانەوەی نییە.پێش ئەوەی فریشتەکان ئیبراهیم بەجێبێڵن مژدەی ئەوەیان پێدا کە خێزانەکەی واتە ساراخاتون کوڕێکی ئەبێ کەناوی (ئیسحاقە). پاشان گەورە ئەبێ و ئەبێت بەپێغەمبەر وە ئەویش کوڕێکی ئەبێت ناوی (یەعقوبە)، ئەویش ئەبێت بەپێغەمبەر وە زۆربەی پێغەمبەرانیش لە نەوەی ئەوە، کاتێ سارا گوێی لەم گفتوگۆیە بوو گوێی لەومژدە خۆشە بوو زۆر سەرسام بوو، لەخۆشییا هاواری کرد وتی: من تازە چۆن منالّم ئەبێت، من تەمەنم زۆر

لەوە زیاترە کە منالّم ببێت وە مێردەکەشم زۆر پیرە و هیچمان هـی ئـەوەنین منالّمـان ببێت. سارا دەم وچاوی سور هەلّگەڕا و هەموو گیانی هاتە لەرزین بەدەنگێکی بـەرز هاواری کرد وتی: ئەمە کارێکی سەرسوڕهێنەرە لەخۆشیانا قیژاندی کە بەلایـەوە زۆر سـەیربوو کـاری وا ڕوبـدات، فریشـتەکان بەسـارایان وت: ئایـە تـۆ لـەکاری خـوا سەرسامیت، پێت وایە ئەم کـارە لای پـەروەردگار کـارێکی زۆرگرانـە ؟ ئـەی ئـازانی خوابیـەوێ کـارێ بکـات ئـەیکات زۆر بەئاسـانی. ئـەی بنەمالّـەی پێغەمبەرایـەتی ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا برژێت بەسەرتانا:﴿قَالَتْ يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَاْ عَجُوزٌ وَهَـــذَا بَعْلِي شَيْخاً إِنَّ هَـــذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ قَالُواْ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ رَحْمَتُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴾هـود:٧٣-٧٢. بـەلّێ سـاراخاتونی داوێـن پـاکی خۆڕاگر حامیلە بوو خوای گەورە (ئیسحاق)ی پێبەخشی. گـەورە بـوو و ژنـی هێنـاو بوو بەپێغەمبەر و کوڕێکی بوو ناوی نا یەعقوب، ئـەویش بـوو بەپێغەمبـەرو نـەوەی زۆری لێکەوتەوە کەنەوەی (بەنو ئیسرائیل)ە .

خوێنەری ئازیز ئەمە بوو کورتەیەك لەژیانی ئەوخاتونە شۆڕە سـوارەی نـاو ژنـانی بـاوەڕدارو لـەخواترس کـە خێزانـی حـەزرەتی ئیـبراهیم و دایکـی حـەزرەتی ئیسـحاقە، سـارا زۆر تـالّی و ئەشـکەنجەو ئـازاری چەشـت لـەپێناو ئـاینی خـواو پێغەمبەرەکەی. سارا یەکەم کەس بوو باوەڕی هێنا بە ئیبراهیم و ئاینەکەی. ئەوە بوو خوای گەورە ناردی بۆ سەرگەلەکەی تا وازبێنن لەبت پەرستی و گومڕایی و سەرپێچی فەرمانی خوا و ڕێگای ڕاست هەلّبژێرن. ئەوە بوو یەکەم کـەس بـاوەڕی پێهێنـا سـارا بـوو. پاشـان (لـــوط)ی بـرازای بـاوەڕی پێهێنـا دروودی خوایـان لەسـەربێت ئـا لەوسـەردەمەدا تـەنها ئـەو سـێ کەسـە بـاوەڕدار هـەبوون بـەئاینی خـوا و ئـاینی ڕاستەقینە . ساراخاتون دوای ئەو هەموو ناڕەحەتی و سەرسەختیە و کێبڕکـێ لەگـەلّ بێباوەڕان لەتەمەنی (١٢٧) سالّیدا کۆچی دوایی کرد. هـەزاران دروود و ڕەحمـەت بـۆ گیانی پاکی خاتونی بەرێز و باوەڕدار.

(٣)

## دایکی قوربانیان

## (هاجەرە)ی دایکی ئیسماعیل

### وخیزانی حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوایان لەسەر بێت)

(هاجەرە) ئەو کەنیزەکە بوو کە فیرعەون بەخشی بە ساراخاتون خیزانی حەزرەتی ئیبراهیم .ئەوە بوو پاش ئەو ڕووداوە ناخۆش و سەختەی کە بەسەر ساراخاندا هات کە پێشتر لە چیرۆکی سارا خاتووندا باسکرا. فیرعەون هاجەرەی بەخشییە سارا خاتوون و ئەویش بەخشییە حەزرەتی ئیبراهیم تا بیکاتە خێزانی خۆی و خوای گەورە کۆرپەیەکیان پێ ببەخشێ.ئەوەبوو حەزرەتی ئیبراهیم لە هاجەرەخاتوون حەزرەتی ئیسماعیلی لێبوو، پاش ماوەیەك ساراخاتوون گومانی زۆری بۆ درووست بوو کە بەهۆی ئیسماعیل وهاجەرە خاتوونەوە حەزرەتی ئیبراهیم خۆشەویستی ساراخاتوون کەم بکاتەوە داوای لە ئیبراهیم کرد تا هاجەرە و ئیسماعیلی کۆرپەلە دووربخاتەوە لێی، دیارە ویستی پەروەردگار وابوو و ئەبوو وابێت، تا ڕوداوەکان زیاتر سەرنجڕاکێشترو ئالۆزتر دروستبێن. ئەوەبوو حەزرەتی (ئیبراهیم ) بەگوێی سارای کرد تا ناکۆکی و دووبەرەکی گەورە دروست نەبێت، بەویستی خوا ئیبراهیم زۆر بەئاسانی ئەم داوایەی سارای قبوڵ کرد و هەستا هاجەرەو ئیسماعیلی کۆرپەلەی پێچایەوەو بێ ئەوەی هیچ بڵێت پێیان ڕابگەیەنێت کەچی ئەکات و بۆچی

ئەم کارە دەکات. بردنی بەرەو شوێنێکی زۆر دوور لەئاوەدانی و خەڵك و شوێنێك کە بێ ئاو وشکانی بێ هیچ جۆرە زەوی و زارێکی کشتووکاڵی وە کەسێکی لێ نەبوو تا بێتە هاودەم و هاوەڵیان لەوێدا هاجەرەو کۆرپەلەی تازەساوای بەجێهێڵا لەگەڵ تۆزێك خۆراك و کەمێك ئاو، ویستی خوا وابوو ئەبوو ئیبراهیم ئیسماعیلی کۆرپەلەی، ئاواتی و تاقە منداڵە نازدارەکەی لەو شوێنە وشك و برنگە بەجێ بهێڵێ ،کە دیارە هەر بەوتن و بیستن ئاسانە ئەم جۆرە ڕوداوانە، ئەوەبوو ئیبراهیم ئەوانی دانا وبێ قسە بەڕێگای خۆیدا گەڕایەوە، تەنها ئەو کەمە خواردن و ئاوەی بۆ جێهێلان، کە خواردنەکە بریتی بوو لەخورماو تۆزێ ئاو . لەوکاتەدا هاجەرە ئەمەی بینی خۆی پێنەگیرا هاواری کرد لە ئیبراهیم بانگی کرد وتی: ئەی ئیبراهیم بۆکوێ ئەڕۆی لەم شیوە چۆڵ و هۆڵ و وشك و برنگە بەبێکەس بە جێماندێڵی بۆ وا ئەکەی مەبەستت چییە ؟

بەلام ئیبراهیم لای نەکردەوە و وەلامیشی نەدایەوە وەك پێی بڵێ کە ئەمە فەرمانی خوایە ئەبێ بکرێ و فەرمانی خوایش بەهیچ شێوەیەك نابێ سەرپێچی بکرێ. ئیتر هاجەرە بۆی دەرکەوت کە شتێکی گرنگ هەیە کە بۆتە هۆی ئەوەی کە ئیبراهیم وەلام نەداتەوە. پاشان هاجەرە جارێکی تر بانگی کردو و وتی: ئیبراهیم ئەم کارە خوا فەرمانی پێکردووی؟

ئینجا ئیبراهیم ئاوڕی دایەوە و فەرمووی: بەڵێ فەرمانی خوایە. با لێرەدا هەڵوێستەیەك بکەین لەسەر باوەڕی پتەوی ئەم خانمە باوەڕدارە کە چۆن لەمانای تەواوی پەرستشی و تاك پەرستی و ڕەحم و دەستەلاتی پەروەردگار تێگەیشتووە، کە باوەڕێکی بەهێزی هەبوو بەوەی کە پەروەردگار چۆن پارێزگاری لەمێردەکەی دەکات، و مێردەکەشی چۆن بەندەیەکی ڕاستگۆو دڵسۆزو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوایە .

وە پەروەردگار بێگومان پارێزگاریش لەئێمە دەکات. نەڵبەت ئەم کارە تاقیکردنەوەیەکی گەورەی پەروەردگارە بۆ ئیبراهیم و هاجەرە .

پاشان هاجەرە لەدڵی خۆیدا وتی:کەواتە پەروەردگار لەناومان نابات وچاودێریمان دەکات. ئیبراهیمی لەخواترس و باوەڕدار بەدڵێکی بەکوڵ و پڕ لەباوەڕوە پاڕایەوە لەپەروەردگار و ئەم دوعایەی فەرموو، فەرمووی: ئەی خوایە من بەجێمهێشتن و بەتۆم سپاردن کۆرپەلەی نازدارو ئاواتم لەگەڵ هاوسەرە باوەڕدارەکەم لەشیوێکی وشك و بێ ئاو لەتەنیشت ماڵەکەی خۆتا کە ڕێزت لێناوەو پیرۆزت کردووە کە نابێ لەتۆ زیاتر هیچ شتێکی تری تیا بپەرسترێت لەوشوێنە پیرۆزەدا بەجێمهێشتن، تا بەدڵێکی بێدارەوە تۆ بپەرستن و نوێژبکەن، ئەی پەروەردگار داوات لێدەکەم کە دڵی خەڵکانیان بۆ نەرم بکەیت و لەبەرنامەکەی تۆ لانەدەن و بێجگە لەتۆ هیچ شتێکی تر نەپەرستن، خوایە گیان هاوەڵ و هاودەمیان بۆبنێری ڕزق و ڕۆزییان لەهەموو جۆرە خۆراکێك و بەروبومێك بۆیان فەراهەم بێنە، و هەمیشە سوپاس گوزاری تۆبکەن و نەوەکانم لەرێگای تۆ لانەیەن. لەڕاستیدا داواکەی حەزرەتی ئیبراهیم گیرابوو، کە ئەو جێگایە ئاوەدان و پیرۆز بوو بەبەردەوامی هەموو جۆرە میوەو خواردنێکی لێنابرێت وهەموو پێغەمبەران لەنەوەو نەسلی ئەوە، ئەوەبوو ئیتر ئیبراهیم ماڵئاوایی لێکردن و بەجێی هێشتن بەتەنها هاجەرە و کۆرپەلە نازدارەکەی لەو شوێنە چۆڵ و هۆڵ و وشك و برنگە و بێئاو و بێکەس جێیهێشتن. ئەوەبوو پاش چەند ڕۆژێك ئەو برە خواردن و ئاوەیشیان پێنەما و تەواو بوو هاجەرە زۆرگەڕا تا لەو ناوە خواردنیك یا تۆزێك ئاوی دەستکەوێت بیخوات، بەڵام بێسود بوو هەرچی گەڕا هیچی دەست نەکەوت. تەواو بێهیوا بوو هیچ نەبوو بیخوات تا بیکات بەشیرو بیدات بەکۆرپەلەکەی،کۆرپەلەی بەستەزمان لەبرسانا زۆر ئەگریاو ئەکڕوزایەوە تا وای لێ هات هێزی گریانیشی پێ نەما خۆی و کۆرپەلە یەك لە یەك شەکەت ترو ماندوو تر بوون هاجەرە لە حەسرەت منداڵەکەی خۆی لە بیر چووبۆوە، کۆرپەلەی بەستەزمان بە شێوەیەك لە برسانا ئەکڕوزایەوە دڵی دایکەی بێ چارەی هێنابوویە کوڵ، لەتاوا هاجەرە ڕای دەکردە سەر شاخی(صەفا) بۆ ئەوەی لەوێوە کەسێك ئاوەدانییەك ببینێت

و ڕزگاریان بکەن لەو نارەحەت و برسێتی‌یە، بەلاّم هیچی نەبینی و هیچی دەست نەکەوت ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە ترسی ئەوەی بوو کە منداڵەکەی جێ هێشتووە نەك دڕندەیەك بیخوات، خێرا بە ناچاری هاتە خوارەوە بۆ لای منداڵەکەی کە لە خوار شاخەکەوە دای‌نابوو، ئەم جارە ڕای‌کردەوە بۆ سەر شاخی (مەڕوە) کە بەرامبەر شاخی (صەفا) بوو. بۆ هەمان مەبەست ڕای کردەوە سەر ئەو شاخەی تر کە شتێ خۆراکێ کەسێ ببینێ و لەو قەیرانە ڕزگاریان ببێت، بەلاّم بێ‌سود بوو هیچی دەست نەکەوت. ئەم ڕاکردنەی لە شاخی صەفاوە بۆ مەڕوە (حەوت)جار دووبارە کردەوە لە شاخی صەفاوە ڕای دەکرد بۆ شاخی مەڕوە تا وای لێ هات شەکەت و ماندوو بوو هێزی لێ بڕا تەواو بێ هیواو بێ تاقەت بوو. نا لەو کاتەدا نزاکەی حەزرەتی ئیبراهیم گیرا بوو. خوای گەورە داناو زانایە و بە بەزەیی‌یە بۆ مرۆڤەکان، بە هەموو شێوەیەك تاقی دەکاتەوە وە پاداشتی مرۆڤەکان بە زیاد لەو نارەحەتیانەی توشیان دەکات پاداشتیان ئەداتەوە، خوای گەورە هات بەدەم نزاکەی حەزرەتی ئیبراهیمەوە، حەزرەتی جوبرەئیلی نارد بەباڵی پیرۆزی دای لە زەوی‌یەکە لە نزیك شوێنی هاجەرەو ئیسماعیل ئاوێکی شیرین و سازگاری لێ هاتە دەرەوە، کە دایکە ئەمەی بینی بە ڕۆیشتنیکی نیمچە خێرا واتە (هەروەلە) خۆی گەیاندە ئاوەکە، بەدەم سوپاس گوزاری خواوە بەرەو ئاوەکە ڕۆیشت سوپاسی خوای کرد بۆ ئەو نازو نیعمەتەی کە پێی بەخشی. هات بە مشتی ئاوەکەی هەڵ ئەگۆزی و ئەیکردە جەوەنەکەی، زۆر بە خێرایی و شپرزەیی ئاوەکەی دەکردە ناو جەوەنەکەیەوە تا بیبات و منداڵەکەی بیخوات و نەمرێت کەمێك لە ئازارەکەی سارێژ ببێت لە کاتی هەڵگواستنی ئاوەکە دەیوت (زەمی، زەمی). ئیتر لەبەرئەوە ناویان نا ئاوی (زەم زەم). حەزرەتی (محمد)درودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت: (ڕەحمەتی خوا لەسەر دایکە هاجەرە ئەگەر پەلەی نەکردایە نەیوتایە بوەستە، ئاوەکە بە باشی ئەهات ئەمەندە زۆر ئەبوو ئەبووە سەرچاوەی ئاوێکی زۆر گەورەو دیاری).

بەڵێ هاجەرە خاتوون دایکی حەزرەتی ئیسماعیل، مێژوونوسان ناویان ناوە بە دایکی عەرەبی عەدنانی یەکان.

ئەوەبوو ئیتر هاجەرەو کۆرپەلەکەی لە تەنیشت ئاوی زەم زەمەوە بەتەنها و بێ هاوەڵ و هاودەم ژیانیان گوزەراند. بەڵام هاجەرە باوەڕی تەواوی هەبوو بە پەروەردگار کە خوای گەورە چاودێریان دەکات و نافەوتێن. هیچ ترسێك کاری لێ نەئەکرد.

کۆمەڵێك خەڵك لە هۆزی (جورهوم) ویستیان لەوێوە بڕۆن بۆ شوێنێکی تر سەیریان کرد باڵندەو پەلەوەر لەو ناوەدا هەیە، ئەوانیش پێیان سەیر بوو چونکە ئەو جێگەیە ئەوان شارەزای بوون چەند ساڵە هاتوو چۆدەکەن لەو ناوە ئاوی لێنییە وەباڵندەش لەشوێنێك دەبێ کەئاوی لێبێت. گەڕان بەو ناوەدا تا بزانن ئەمە چییە بۆچی باڵندەی لێ یە؟ سەیریان کرد لەو دوورەوە ژنێك و منداڵێك لەلای تروسکایی ئاوێکەوە دانیشتون. زۆر سەریان سوڕما پێشتر ئەوجێگایە چەند جار پیایا ڕەت بوون هیچ ئاوێکی لێ نەبووە ئەمە چییە ؟

نزیك بوونەوە لەهاجەرەو کۆرپەلەکەی سڵاویان لێ کردوو پێیان وت: تۆ ڕازیت ئێمە بێینە لات و دانیشین لەگەڵت ئەم ناوە ئاوەدان بکەینەوە؟ هاجەرەش بەخۆش حاڵییەوە پێی وتن: بەڵێ ئەتوانن لەم ناوە بژین بەمەرجێ ئاوەکە لەژێر چاودێری خۆمدا بێت چونکە پەروەردگار خۆی بەڵێنی داوە ئەبێ ئاوەدانییان بۆینێرێ و بەشێوەیەکیش ئەو ناوە ئاوەدان بکاتەوە تا دنیا دنیایە خەڵك لەهەموو دنیا ڕوی لێ بکەن. ئینجا هۆزی (جورهوم) هاتن و دەوریان دا و خانوویان لەدەوری ئاوەکە دروست کرد، وە کاریان ئەکرد و لە ئاوەکەیان ئەخواردەوە و بەکاریان ئەهێنا تا ئیسماعیل لەناویاندا گەورە بوو و لەگەڵیاندا وەکو ئەوان هەڵسوکەوتی دەکردو گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن، تا فێری زمانی ئەوان بوو کە زمانی (عەرەبی ) بوو. تا وای لێهات تەواو بوون بە بەشێك لەهۆزی (جورهوم).

جارێکی تر پەروەردگار ویستی تاقیکردنەوەیەکی گەورە تر و گرانتر بەکاربهێنێ بۆ دایك و باوکی ئیسماعیل جارێکی تر، ئەوەبوو لە خەوی حەزرەتی ئیبراهیم دا خوای گەورە فەرمانی کرد بە حەزرەتی ئیبراهیم ئیسماعیلی تازە پێگەیشتوو سەربڕێ و بیکاتە قوربانی. دیارە پێغەمبەران خەویان جۆرێکە لەپەیامی پەروەردگار بۆیان نابێ سەرپێچی بکەن لەخەونەدا چییان پێبوترێ ئەبێ جێبەجێی بکەن ، حەزرەتی ئیبراهیم هاتە لایان زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی پەروەردگار ئاوەدانی و هاودەمی بۆناردون ئینجا خەونەکەی بۆ ئیسماعیل گێڕایەوە بێگومان نەوەیەك لەو دایك و باوکە ئارام و باوەڕدارە بێت ئەبێ خاوەنی چ باوەڕێك بێت چۆن فەرمانی خوا لەلای گران و قورس بێت هەرگیز سەرپێچی فەرمانی خواناکات وە دڵی پەیوەستە بەپەروەردگارەوە، ئیسماعیل بەهێمنی و بەجوانی وەڵامی باوکی میهرەبان و باوەڕداری دایەوە فەرمووی: ئەی باوکی شیرینم چۆن فەرمانت پێکراوە مەترسە کاری خوا بەجێبهێنە من ئارام ئەگرم تۆش هەروەها. تا لەو کاتەدا دەستی کوڕە ئاواتییە تازە پێگەیشتووەکەی گرت و بەرە و سەربڕین بردی. با بزانین کاری شەیتان کە هەرگیز واز لەمرۆڤەکان ناهێنێت تەنانەت لە پێغەمبەرانیش چی دەکات. بێگومان شەیتان بۆ فرسەتێك دەگەڕێت، ئەمەی بەفرسەت زانی خێرا چووە لای هاجەرەو پێی وت: ئەی هاجەرە بۆ وا دانیشتووی تۆ نازانی ئیبراهیم کوڕە نازدارە ئاواتیەکەت بۆکوێ ئەبا سەرەڕای ئەو هەموو برسێتی و نارەحەتیەی چەشتت بەتەنهاو بێ هاودەم تا ئەم کۆرپەلەیەت پەروەردەکرد ئێستا باوکی ئەیبات سەری ئەبڕێ، ڕاکە فریای کەوە مەهێڵە سەری ببڕێ، بەڵام هاجەرەی باوەڕدار بەدڵێکی لەکوڵەوە لەناخا زۆر نارەحەت بوو بەڵام فەرمانی خوا نابێ پشتگوێ بخرێت، ئەیزانی ئیبراهیم پێغەمبەری خوایەو کارێ ناکات تا خوا ئەمری پێنەکات. بێگومان ئەمکارەش جۆرێکە لەتاقیکردنەوەی پەروەردگار بۆیان، لەوەڵامدا وتی: ئەو لەمن زیاتر کوڕەکەی خۆش دەوێ و بەپەرۆشە

بەلاّم ئەلّبەت ئەمە فەرمانی خوایە، هەرچیش فەرمانی خوابێت مـن پێـی ڕازیـم. هاجەرە شەیتانی دەرکردو ڕاوی نا.

ئیتر شەیتان زانی بێسودە لەگەلّ هاجەرە قسەکردن یەکسەر چوو بۆلای حەزرەتی ئیبراهیم پێی وت: تۆ ئەم کوڕە بۆکوێ ئەبەیت ئەوەی لەخەودا دیوتە فەرمانی خوانییە بەلّکو خەونێکی هەلّیت و پەلّیتە، هەرگیز کاری وا مەکە کوڕەکەت سەرمەبڕە لەپێناو خەونێکدا. ئیبراهیم لەوەلاّمدا وتی: ئەمە فەرمانی خوایە هەر ئەبێ جێبەجێ بکرێ وازم لێبێنە با لەجێبەجێ کردنی فەرمانی پەروەردگارم دوانەکەوم، دەری کردو ڕاوینا. شەیتان هەمدیس زانی لەگەلّ ئەویش هیچی پێناکرێ ئینجا چوو بۆ لای ئیسماعیلی تازە پێگەیشتوو پێی وت: ئەزانی باوکت بۆ کوێت دەبات، چیت لێدەکات؟ ئەتبات لەپێناو خەونێکی پڕوپووچدا سەرت ببڕێ و ژیانی تۆ بفەوتێنێ، تۆ گەنجیت پێویستە بژیت، تامی ژیان بکەیت بۆ ئەهێلّی، مەهێلّە سەرت ببڕێ ئیسماعیلیش لەوەلاّمدا وتی: مـن خـۆم ڕازیـم خـۆم پـێم وتـووە چـونکە ئەمە فەرمانی خوایە نابێ جێبەجێ نەکرێ لاچۆ وازبێنە با دوانەکەوین لەجێبەجێکردنی فەرمانی پەروەردگارمان پاشان دەری کرد، ئیتر شەیتان زانی هیچی پێناکرێ لەگەلّ کەسیان وازیهێنا لێیان چاری نەماو ڕۆیشت.

لەوکاتەدا ئیبراهیم ئیسماعیلی پالّخست و چەقۆکەی خستە سەرگەردنی بۆئەوەی سەری ببڕێ ئا لەوکاتەدا پەروەردگار زۆر دلّخۆش بوو بەم گوێڕایەلّیەی بەندەکانی. لەوکاتەدا پەروەردگار لەئاسمانەوە بەرانێکی قەلّەوی ناردە خوارەوە پێی فەرموو واز لەئیسماعیل بێنە و ئەو بەرانە سەربڕە و بیکەرە قوربانی لەبری ئیسماعیل، لەهەموو تاقیکردنەوەیەك تۆو هاجەرەو ئیسماعیل دەرچوون، بەختەوەری بۆتان. پاشان ئیبراهیم زۆر بەسوپاس گوزارییەوە ئیسماعیلی لەسەر ئەرزەکە هەلّسانەوە و بەیەکەوە بەرانەکەیان سەربڕی و کردیانە قوربانی ڕووڕەشی و بەدبەختی بۆشەیتان مایەوە .

بەڕاستی ئەمەیە خۆگری و باوەڕداری و پەیمانی ڕاستیی لەگەڵ پەروەردگار.

ئیبراهیم ئیتر بەجێی هێشتن و گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی. ئیسماعیل گەورە بوو ژنێکی هێنا لەوهۆزەی کە لەگەڵیانا پەروەردە بوو، پاشان هاجەرەی دایکی وەفات دەکات لەتەمەنی (٩٠)ساڵیدا. حەزرەتی ئیسماعیل سپاردەی خاکی کرد لەتەنیشت کەعبەی پیرۆزدا.

ڕۆژێك ئیسماعیل دەچێت بۆڕاو تا بژێوی ژیانیان پەیدابکات و بژین و ژینی پێ بەرێوەبەرن. لەوکاتەدا حەزرەتی ئیبراهیم دێ بۆسەردانی کردنیان، ئەچێ بۆ ماڵیان ژنێك دێ بەدەمیەوە ئەویش ژنەکەی ئیسماعیلی کوڕیەتی سڵاوی لێکردو وتی: ئیسماعیل لەکوێیە؟ ژنەکەی وتی: چووە بۆڕاو تا نێچیرێکی دەست کەوێت و ژیانمانی پێ بگوزەرێنین. دوایی پرسیاری لێکرد وتی: ژیان و گوزەرانتان چۆنە؟ ژنەکەی ئیسماعیل وتی: گوزەرانمان هیچ باش نییە، زۆر خراپە ژیانمان. بەڵام ژنەکەی ئیسماعیل نەیزانی ئەم پیاوە ڕیش سپییە باوکی مێردەکەیەتی. ئیبراهیمیش خۆی ناشکرا نەکرد پاشان ئیبراهیم پێی فەرموو: ئەگەر ئیسماعیل هاتەوە سڵاوی لێ بکەو پێی بڵێ چێوەی دەرگاکەی بگۆڕێ ئینجا ڕۆی، دوایی ئیسماعیل هاتەوە، پرسیاری لە ژنەکەی کرد وتی: ئەمڕۆ کەس نەهات بۆ ماڵمان؟ ژنەکەی ڕوداوەکەی بۆگێڕایەوە و وتی: پیاوێکی ڕیش سپی هات بۆ ماڵمان نەم ئەناسی پرسیاری تۆی کرد وتم: چووە بۆ ڕاو. پاشان پرسیاری گوزەرانمانی کرد، وتم: ژیانمان هیچ باش نییە. پێش ئەوەی بڕوات وتی: ئەگەر ئیسماعیل هاتەوە سەلامی لێ بکە، و پێی وتم کەپێت بڵێم: چوارچێوەی دەرگاکەت بگۆڕی. یەکسەر ئیسماعیل زانی کە ئەو پیاوە باوکێتی، بەژنەکەی وت: ئەوە باوکم بوو مەبەستیشی لەوقسەیە ئەوە بووە کە تۆ قەناعەتت بەژیانی من نیە ئەبێ لەیەك جیاببینەوە. ئەوەبوو ئەمجارەش ئیسماعیلی گوێڕایەڵ لەفەرمانی باوکی دەرناچێ لەژنەکەی جیابوویەوە، پاش ماوەیەکی تر ئبراهیم وەك جاری پێشووتر هاتەوە بۆ سەردانی کوڕەکەی، هەمدیس ئیسماعیل چووبوو بۆ ئیش.

دیاره ئیشی ئیسماعیلیش ڕاوکردن بوو، ئیبراهیم لەدەرگای دا و ژنی دووەمی ئیسماعیلی بینی، فەرمووی لێکردو پاشان ئیبراهیم وتی: ئیسماعیل لەکوێیە؟ وتی: چووە بۆ ڕاو ئەگەرخوا مەیلی لێبێت نێچیرێك ڕاوبکات و بژێوی ژیانمانی پێ بەڕێوەبەرین. وتی: ئەی ژیانتان چۆنە؟ لەوەلاّمدا وتی: سوپاس بۆ خوا ژیانمان زۆر ئاسودەو خۆشە لەهیچمان کەم نییە. بەرلەوەی بڕوات بەژنەکەی ئیسماعیلی وت: ئەگەر ئیسماعیل هاتەوە سەلامی لێبکەو پێی بڵێ چێوەی دەرگاکەی زۆر باشە بیپارێزێ. ژنەکەی ئیسماعیل نەیزانی ئەمە باوکی ئیسماعیلە، ئەویش خۆی ئاشکرا نەکرد پاشان ئیسماعیل هاتەوە پرسیاری لەژنەکەی کرد وتی: ئەمڕۆ کەس نەهات بۆماڵمان؟ وتی: با، پیاوێکی ڕیش سپی هات نەمناسی بەلاّم ئەو تۆی ئەناسی وتی: ئەی هیچی نەوت؟ وتی: با، پرسیاری گوزەرانمانی کرد. وتم: سوپاس بۆ خوا زۆر باشین لەهیچمان کەم نییە. بەرلەوە بڕوات وتی: ئەگەر ئیسماعیل هاتەوە سەلامی لێبکەو پێی بڵێ چێوەی دەرگاکەی زۆر باشە بیپارێزێ. ئینجا ئیسماعیل وتی: ئەوە باوکم بوو مەبەستیشی لەوقسەیە ئەوەیە کە تۆ بەژیانی من ڕازیت و پارێزگاریت لێبکەم و لێك جیانەبینەوە و لەگەڵ تۆدا بژیم.. خۆشەویستان بۆیە لێرەدا باسی بەسەرهاتی ئەو دوو ژنەی ئیسماعیلمان کرد، ئەوانیش بۆخۆیان وانەو ئامۆژگارییان تیایە. بەڵێ ئەمە ئەوەی ئەو دایکەی کە بەدایکی عەرەب ناسراوە کە ژنێکی باوەڕدارو بەئارام و خو و ڕەوشت بەرزو گوێڕایەڵ بەهەموو فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی بوو. بەهەموو شێوەیەك گوێڕایەڵی خواو مێردە باوەڕدارەکەی دەکرد بەجوانترین شێوە پەروەردەی منالّەکەی کرد تا ئەویش بەندەیەکی باوەڕدارو بەئیمان بێت، ئەوەی بەسەر هاجەرە هات هەتاهەتایە ناسرێتەوە. نمونەی تاقیکردنەوەیەکی سەخت و ناخۆش بوو، لەتاقیکردنەوەی یەکەمدا دوورخستنەوەی خۆی و کۆرپەلەکەی لەمێردوکەس و کارو ئاوەدانی برسێتیو نارەحەتی و بێ هاودەمی، پاشان سەر برینی کۆرپەلەی ئاواتی و تازەپێگەیشتوو لەلایەن مێردەکەیەوە لەسەرفەرمانی پەروەردگار، هاجەرە بەمانە

هەمووی ڕازی بوو لەبەرخاتری پەروەردگار، هەردەم سوپاسی خوای دەکرد وئەیزانی پەروەردگار بەردەوام چاودێریان دەکات و زوڵمیان لێناکات. هەمیشە هاجەرەخاتوون کارە جوان و بەرەحمەکانی پەروەردگاری دەبینی و هەستی بەرەحمی خوا دەکرد. لەکاتە ناخۆش و دژوارەکاندا رەحم و بەخشندەیی پەروەردگار لەناخیا هەڵەقولا، بەڕاستی سەختە کۆرپەلە کڕوزانەوە لەبرساو لەترسا ، کۆرپەلە سەربڕین چ بۆباوك چ بۆدایك بەتایبەتی بۆ دایك، بەلاّم ئەم هاوسەرە باوەڕدارانە فەرمانی خوا قورسترە لەهەموو شتیّ لەلایان وە ڕازین بەهەموو ناخۆشییەك لەپێناو خوادا. ئەوەبوو شەیتان هەردەم لەبۆسەدا بوو بۆیان سیّ جار زۆر بەسەختی ڕێی پێگرتن لەسیّ شوێنی جیادا بەهاجەرە، و ئیبراهیم و ئیسماعیلیش تا ڕازیان بکات کە ئەو فەرمانی خوایە بەجێنەهێنن و بەر نەفرەتی خوا بکەون وەك خۆی، بەلاّم ئەمان لەهەرسیّ شوێنەکە شەیتانیان ڕاوناو شەرمەزاریانکرد. ناودەبرێت بەرەجمی شەیتان وە حاجیان لەکاتی مەوسیمی حەجدا حاجیان لەهەرسیّ شوێنەکەدا شەیتان ڕەجم دەکەن بەشێوەی ئیبراهیم و هاجەرەو ئیسماعیل. وە لەتاقیکردنەوەی یەکەمدا هاجەرە لەنێوان شاخی سەفاومەروە (٧)جار ڕای ئەکردو ئەگەڕایەوە لای کۆرپەلەکەی بۆئەوەی کەسیّ یا شتێك ببینیّ تا ڕزگاریان بێت لەوبرسیەتیەی کە توشیان بوو لەوچۆڵەوانیە وە ئەم کارەش لەسەرحاجیان فەرزکرا لەکاتی حەجدا(٧)جار لەنێوان شاخی سەفاو مەروە ڕاکەن، لەو کاتەوەی حەج فەرزکرا تا دنیا دنیایە هەموو حاجیان شوێن کردەوە و کاری خانمێك دەکەون، کاری خانمێك بەئەنجام دەگەیەنن. لێرەدا پرسیارێك دەکەین، ئایا ئەمە جوانترین پلەنییە کە پەروەردگار بەخشیویەتە ئافرەتان کە ئافرەتێك هەڵبژێرێت و بیکاتە مامۆستای هەموو حاجیانی دنیا؟ بەڕاستی جیّی شانازیە بۆ خانمان کە هاجەرەی مامۆستای حاجیان ژن بوو، وە پەروەردگار ڕێزی لێناو ئەو هەموو پیرۆزییەی پیّ بەخشی، وەك لەناو باسەکەماندا باسمانکرد هاجەرەخاتوون لەتەمەنی (٩٠)ساڵیدا وەفاتی کرد، و ئیسماعیلی کوڕی لەتەنیشت کەعبەی پیرۆزدا

ئەسپاردەی خاکی کرد، هەزاران درووود و ڕەحمەت بۆگیانی پاکیزەیی مامۆستای حاجیان تێکۆشەر لە پێناو فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیدا، خاتوو هاجەرە دایکی حەزرەتی ئیسماعیل و خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوایان لەسەربێت .

ئەمە کورتەیەك لەژیانی خانمێ کەناوتەبرێ بەدایکی قوربانی و دایکی عەرەبی عەدنانیەکان. پێش ئەوەی کۆچ بکاو دنیا بەجێبێلێت ڕێگەو سوننەتێکی بۆ بەجێ هێلاوین کە بەڕاستی هەرئەوە شایانی ئەوەیە، کە بۆتە نمونەیەکی پەسەندو گونجاو و بێ وێنە بۆ مێردە لەخواترس و بەئارامەکەی، کە بەجوانترین و نایابترین شێوە گوێڕایەڵی و هاوسۆزی پێشکەش کرد زۆر بەمەردانەو ڕاستگۆیانە بەو شێوە کە خوا لێی ڕازی بێت، ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە چۆن بەپەرۆشی و دڵسۆزی و سۆزدارییەوە کوڕەکەی پەروەردەکرد بەو هەموو نەهامەتی‌یەی کە باسکرا. بەڕاستی ئەم گەورەیی و میهرەبانی و سۆزو ڕاستگۆییە لەیەکێکی وەك ئەو خانمە باوەڕدارە کە باوەڕێکی لەبن نەهاتوو و بەهێزی نەبێت کەس جورئەتی ئەوەناکاو شایانی ئەوە نییە. کە هونەرو ئازایەتییەکەشی ئەوە بوو دەیزانی مێردەکەی ماوەو نەمردووە. هیچ غیرەی نەکرد گوێی نەدایە بەو باوەڕو ئیمانە جوانەوە کۆرپەکەی بۆ بەخێوکرد بەجوانترین شێوە چونکە ئەیزانی مێردەکە فەرمانی خوا جیبەجێدەکات .هەزاران درووودو ڕەحمەتی خوای لێبێت.

## (٤)



# خێزانی حەزرەتی ئەیوب
# ناوی ( ڕەحمە ) یە و لەنەوەی حەزرەتی یوسفە
### (سەلامی خوایان لەسەر بێت)

ژنیکی باوەڕدارو ئارام دڵسۆزو بەوەفا بۆمێردەکەی، ئەمانە و چەندین سیفاتی تر لەڕەوشتە بەرزەکانی ئەم خاتونە بوون، ئەوە بوو حەزرەتی (ئەیوب) پەروەردگار سەروەت و سامان و مەڕومالاَت و منالێکی زۆر و باشی پێ بەخشی بوو، زۆر دڵ خۆش بوو. لەپڕ پەروەردگار ڕۆژدوای ڕۆژ بەلاَو نارەحەتی و نەخۆشی توش دەکرد، وای لێهات تەواو نەخۆش کەوت سست بوو. بەلاَم ئەم خاتوونە باوەڕدارە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر باشتر خزمەتی دەکردو دەیلاواند. هەر نارەحەتییەك کە توشی دەهات بەباوەڕیکی جوانەوە دەیگەڕاندەوە بۆ تاقیکردنەوەی پەروەردگار. بەڕاستی ئەم خاتوونە نمونەی خاتوونێکی باوەڕدارو بەئارام بوو، حەزرەتی ئەیوب سەلامی خوای لەسەربێت زۆر باوەڕدارو بەئارام بوو ئارامییەك کە بەهیچ شێوەیەك وێنەی نەبووەو نابێ. هەمیشە سوپاس گوزاری پەروەردگاری دەکرد. پەروەردگار سەروەت و سامانیکی زۆرو بیشوماری پێبەخشیبوو وە کۆمەڵێ منالی باشی هەبوو وە چەندین ئیشکەرو خزمەت گوزاری هەبوو کە کارەکانیان دڵسۆزانە بۆ جێبەجێدەکرد، مەڕومالاَتێکی زۆری هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا ئەیوب بەردەوام هاوکاری هەژارانی دەکرد

و یارمەتی دەدان بەبێ جیاوازی زۆر بەخشندەبوو، پەروەردگار کاتێ ئەم هەموو نیعمەتەی پێ بەخشیبوو ویستی وا بوو ئارامی و باوەڕی پاکی ئەیوب تاقی بکاتەوە. ئەبێ ئەوە بزانین کە پەروەردگار ئاگاداری هەموو کردەوەیەکی بەندەکانیەتی تەنانەت ئەوەیشی لەدڵەکاندایە و شاراوەیە، بەڵام هەموو تاقیکردنەوەیەکی پەروەردگار پڕە لەپەندو ئامۆژگاری بۆ مرۆڤەکان بەتایبەت بۆ باوەڕداران. لەیەکەم تاقیکردنەوەی خوا بۆ ئەیوبی باوەڕدار بەنەمانی ماڵ و سامانەکەی دەستی پێکرد بە وشکەساڵی بەجۆرێ هەموو کشتوکاڵەکەی وشك بوون، مەڕوماڵات و کشتوکاڵەکەی لەبەر بێبارانی هەموو لەناوچون ونەمان. ڕۆژدوای ڕۆژ هیچی نەئەما وای لێهات ئەیوب هیچ بژێویەکی ژیانی نەما، بەڵام ئەیوبی بەئارام پشتی بەمیهرەبانی پەروەردگار ئەبەست هەمیشە وهەردەم ئەیوت ئەمانە سپاردەی پەروەردگاربوون ئەیەوێت بیباتەوە هی خۆیەتی، ئارەزووی هەبێ پێمان ئەبەخشێ وە بەپێچەوانەشەوە وە ئەو سامان و دەوڵەتەش بەمنی بەخشی ماوەیەك لام بوو سودم لێبینی و ئێستاش ئەیەوێت بیباتەوە، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی پێبەخشیم، سوپاس بۆ خوا لەکاتی بەخشیندا و هەم لەکاتی لەناوبردنیشدا چونکە پەروەردگار خاوەنی هەموو شتەکانە هەمووی هی خۆیەتی ئارەزوی لێبێت ئەیبەخشێت وە بەپێچەوانەشەوە. بیەوێت کەسێك سەربەرزو شکۆمەند بکات ئەیکات وە بیەوێت کەسێ قێزەون و ناشرین کات بەتوانایە..

لەدوای ئەم قسانە سوجدەی دووردورێژی برد بۆ پەروەردگارو سوپاسی خوای کرد .

پاشان پەروەردگار ویستی بەشێوەیەکی سەختتر تاقی بکاتەوە ئەویش مردنی هەموو منداڵەکانی بوو، هەموویانی لەناوبرد. حەزرەتی ئەیوب خۆی و ژنە باوەڕدارەکەی زیاتر لەجاران سوپاسی خوایان دەکرد و ڕازی بوون بەو نەهامەتییەی کە توشیان هات، هەمدیس وەك هەمیشە سوجدەیەکی دوورو درێژی بۆ پەروەردگار بردو

سوپاسی خوای کرد و پڕبەدڵ ڕازیبوونی خۆی بەقەدەری پەروەردگار بەجوانترین شێوەدەربری، ئەمجارە پەروەردگار ویستی بەتاقیکردنەوەیەکی تر خۆی و ژنەکەی تاقیبکاتەوە ئەویش بەنەخۆشی و لاوازبوونی جەستەی، بەشێوەیەك وردە وردە لاواز دەبوو ڕۆژ دوای ڕۆژ دەردەدار ترو داماو تر دەبوو بەونەخۆشییەی کە توشی هاتبوو. مەگەر ئەیوب بتوانێ بەرگەی بگرێ ئەویش بەنارامی‌یە جوانەکەی لەگەڵ ئەو هەموو دەردو ناخۆشیەدا تا دەبوو زیاتر ئارامی دەگرت و باوەڕدار تر دەبوو وە زیاتر سوپاسی خوای دەکرد .

سالآنێك بەنەخۆشی و هەژاری تێپەڕی، نەخۆشیەکەی ڕۆژدوای ڕۆژ دژوار تر دەبوو. وای لیهات زۆرلاواز بوو، تەواو بێ هێز بوو ئێسقانەکانی لاشەی تەواو دەرکەوت هیچ گۆشتی بەڕووەوە نەما، کووڕبوو ڕەنگی بەڕووەوە نەما خۆی پێ ڕانەئەگیرا، لەسەرجێگا لەتاو ئازارو ناڕەحەتی هەموو لاشەی کرم تێیدا تا وای لێهات دۆستەکانی لێی بێزاربوون و لێی دووردەکەوتنەوە، لەبری سەردانی‌کردن و دلنەوایی کردن لی‌ی تورەدەبوون و بێزاریان دەکرد. لەبەر نالّەو هاوار لە لایەك لەتاو بۆنی ناخۆشی جەستەی لەلایەکی تر.

خۆشەویستان و دۆستانی ڕایان دەکرد لێی، کەس نزیکی نەدەبوویەوە تا وای لێهات لەشار دووریاخستەوە، بردیان لەکەلاوەیەکدا فڕێیان دا، ڕۆڵ و کاریگەریی وە باوەڕو وەفای خانمی خێزانی لێرەوە دەردەکەوێت بزانین کێ لەم کاتەدا فریای دەکەوێت و لەلای دەمێنێتەوە؟ بێگومان خێزانی بەوەفاو باوەڕداریەتی، چۆن خۆشییەکان لەگەڵ مێردەکەی بەسەردەبات ئاواش لەگەڵ ناخۆشییەکانیا ئەژی ئێستا لەگەڵ مێردە فڕێدراوەکەیدا لەکەلاوەیەکی دوور لە ئاوەدانی و بێکەس لەگەڵ ئازارەکانی مێردەکەیدا ژیان بەسەردەبات. زۆر ڕاستگۆیانە بەدڵێکی گەورەو میهرەبانەوە هەرچی لەتوانادا بوو ئەیکرد بۆدڵنەوایی‌کردن و کەمکردنەوەی ئازاری هاوسەرەکەی، هەموو ئاوات و هەوڵێکی لەپێناو مێردە نەخۆشەکەیدا بوو زۆر بەئارام

و بەئەمەك بوو هەتا مێردەكەی نارەحەت تر بوایە بەپەرۆشتر خزمەتی دەكرد، ئەویش لەبەرخاتری پەروەردگار .

ئەم خانمە بەوەفایە بەهیچ شێوەیەك لەمێردەكەی دوورنەئەكەوتەوە هەرگیز بیری لەوە نەئەكردەوە لێی جیاببێتەوە و وازی لێبێنێت. لەوكاتەدا باشترین و باوەڕدارترین ژن بوو لەسەر زەمیندا (المرءة الصالحة خیر من الدنیا وما فیها). بەڕاستی وا بوو، باشترین ژن بوو بۆ میردەكەی هەرچی لەتوانایدا بوو ئەیویست بیكات بۆ مێردەكەی و سۆزو خۆشەویستی خۆی زۆر بە جوانی بۆی دەردەبڕی تا مێردەكەی هەست بەئارامی و خۆشەویستی ئەم بكات، خاتونی بەڕێز زۆر ڕازی بوو لەو ژیانەی كە تیایدا ئەژیا، ڕازی بوو بەو هەموو توانج و قسەوباسانەی كە تێیان ئەگرت، ڕازی بوو بەو هەموو برسێتی و نارەحەتییەی كە توشی هاتبوو وای لێهات هیچ نەبوو بیخوات و بیدات بەمێردەكەی. ئەچوو ئیشی دەكرد تا بژێوی خۆی و میردەكەی پەیدابكات و بەو پارەیەی كە وەریدەگرت لەبری ئیشكردنەكەی خواردنی پێ دەكڕی وئەیدا بەمێردە نەخۆشەكەی و زۆر بەجوانی خزمەتی دەكردو دەیلاواندەوە، زۆر نارەحەت دەبوو بەو هەڵسوكەوتە ناشرینانەی كە بەرامبەر مێردەكەی دەكرا بەڵام هیچ دەستەڵاتێكی نەبوو تەنها خۆیی و مێردە نەخۆشەكەی و خوای میهرەبان شك ئەبات بەڵام زۆرپشت ئەستور بوو بەپەروەردگار.. بەداخەوە ئێمە ئەگەر بمانەوێت باسی جوامێری و باوەڕو ئارامی و ڕەفتاری ئەم خاتونە بكەین ناتوانین هەرگیز وەكو خۆی باسی بكەین، لەگەڵ ئەو هەموو خۆڕاگری و ئارامی وباوەڕە جوانەیدا، بەڵام شەیتانی زۆردار بەهیچ جۆرێ خۆشحاڵ نییە بەم ڕەفتارە جوامێرییە لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار. چۆن وازیان لێدێنێ بەردەوام دڵەڕاوكێ و وەسوەسەی ئەخستە دڵیەوە پێی ئەوت: بۆچی خوا ئەم هەموو نارەحەتی و نەخۆشییەی توشی ئەیوب كردووە، خۆ ئەو پیاوێكی باش و بۆ خواژیاوە، هیچ خراپەیەكی نەكردووە كە شیاوی ئەم هەموو بەڵاو دەردەبێت؟ بەڵام خاتونی باوەردار هەیشە لەپەروەردگار دەپاڕایەوە كە شەیتان زاڵ

نەبێت بەسەریداو بتوانێ بەباشی خزمەتی مێردەکەی بکات و دووربێت لەدوودڵی و وەسوەسەی شەیتان، بەڵام خاتوونی بەوەفا ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاترو جوانتر خزمەتی مێردەکەی دەکرد و دڵنەوایی دەکرد. بەجوانترین شێوە ئەیلاواند بەدرێژایی (٧)ساڵ بەوشێوەیە ژیانیان بەسەربرد. ڕۆژێکیان خێزانەکەی حەزرەتی ئەیوب زۆر سۆزی جۆشا بۆ ئازارو نارەحەتی مێردەکەی و زۆر بەزەیی بەحەزرەتی ئەیوبدا ئەهاتەوە چوە بەردەمی پێی وت: کە داوابکات و بپاڕێتەوە لەپەروەردگار داوای شیفای لێبکات تا خوای گەورە شیفای بۆ بنێرێ. لەوەڵامدا حەزرەتی ئەیوب بەخێزانەکەی وت: چەند ساڵ ژیانمان لەخۆشیابوو تاسودەو کامەران بووین؟ وتی: (٨)ساڵ ، پاشان پێی وت: ئەی چەندساڵە نارەحەتین؟ وتی: (٧) ساڵ. دوایی حەزرەتی ئەیوب وتی: چۆن ئەتوانم داوای چاك بوونەوە بکەم، شەرمەکەم لەپەروەردگارم چونکە هێشتا ماوەی نەخۆشیەکەم نەگەیشتۆتە ماوەی بەختەوەریەکەم، من شەرمەکەم داوای شیفاو چاك بوونەوە بکەم.. ئیتر ئەیوب زانی خێزانی خەریکە تەسلیمی وەسوەسەی شەیتان نەبێت، زۆری پێ ناخۆشبوو کە ژنە جوامێرەکەی ئەم داوایەی لێ کرد چونکە ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە ژنەکەی لەبەردەم شەیتاندا لاوازبووە. حەزرەتی ئەیوب سوێندی خوارد ئەگەر چاك بوویەوە و خوای گەورە شیفای بدات ئەوا لەبری ئەوەی کە وا ژنەکەی تەسلیم بە فێڵی شەیتان بووە (سەد توڵی لێبدات ) چۆن ئەبێ ژنێکی جوامێرو باوەڕدار بەو هەموو باوەڕەیەوە شەیتان فریوی بدات زۆرێك لەزانایان ونوسەران ئەڵێن ئەیوب خۆی پێ ڕاگیرا تەحەمولی هەموو ئازارو نارەحەتییەکی دەکرد، تا وای لێهات کرم دایە هەموو لاشەی. وای لێهات کرمەکان خەریکبوو بدەنە ناوسکی، لەم کاتەدا حەزرەتی ئەیوب دوعای کرد وتی: خوایەگیان داوات لێدەکەم وام لێنەکەی کرمەکان بدەنە دڵم، چونکە دڵم خۆشەویستی تۆی تیایە ئیتر ناتوانم زیکرو خواپەرستی وەکو پێویست بکەم، ئا لێرەدا خوای گەورە مژدەی سەرکەوتنی دایە حەزرەتی ئەیوب کە لەو هەموو تاقیکرنەوە سەختانە دەرچووکە پەروەردگار توشی

کردبـــوو بۆئـــەوەی تاقیبکاتـــەوە. پـــێی فـــەرموو: مـــژدەت لێبێـــت لەهـــەموو تاقیکردنەوەکانی پەروەردگار سەرکەوتوو بووی، خوای گـەورە شـیفای نەخۆشـییەکەی دا. بەڕاستی حەزرەتی ئەیوب زۆر خۆڕاگرو بەئارام بوو زۆر ڕاستگۆ بوو لەگەڵ پەیمانی پەروەردگارا. تـا دنیـا دنیایـە وێنـەی صـەبری ئـەیوب نابینرێت. لەوکاتـەدا خێزانـە بەوەفاکەی چوو بوو بۆ ئیش کردن ئەیوب تەنها بوو، پەروەردگار فەرمانی پێکرد کـە لەشوێنی خۆیدا قاچی بدات بەئەرزا، ئەیوبی باوەڕدار قاچی کێشـا بەئـەرزا، ئـاوێکی سازگارو جوانی لێ هەڵقولا. پەروەردگار ئاگـاداری کـردەوە لـەو ئـاوە بخـوات و خـۆی لێبشوات، حەزرەتی ئەیوب لەئاوەکەی خواردەوەو خۆی لێ شت یەکسەر پێستی چـاك بوویەوە و خوای گەورە شیفای بۆ نـارد و لاشـەی وەکـو خـۆی لێهاتـەوە و لـەفرِوفێڵی شەیتان ڕزگاری بوو. لەوکاتەدا خێزانەکەی هاتەوە حـەزرەتی ئـەیوبی نەناسـیەوە زۆر ترسا وای زانی مێردەکەی شتێکی لێبەسەرهاتووە، چووە لای پرسـیاری لێکـرد وتـی: پیرە پیـاوێکی نـەخۆش و لاواز لـەم کـەلاوە دابـوو نـازانی چـی لێبەسـەرهاتووە؟ زۆر شپرزەو شڵەژاوبوو، حەزرەتی ئەیوب یەکسەر ڕوی کردە ژنە بەئارامەکەی و وتی: ئەی هاوسەرە خۆشەویستەکەم ئەوە منم کاتێ تـۆ لێـرە نـەبوویت پـەروەردگار شـیفای بـۆ نـاردم.. بـۆی باسـکرد چـی لێبەسـەرهاتووە ڕوداوەکـەی بۆگێڕایـەوە، خێزانـە میهرەبانەکەی پڕبەدڵ لەوێدا سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر ئەونیعمەتە جوانانەی خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ﴾ ص:٤١، پاشـان خـوای گـەورە هەرچـی هـەی بـوو بەباشـتر بـۆی گەڕانـدەوە لەسـامان ومـاڵ ومنـاڵی بـاش و سـالح، زۆر لـەجاران خۆشـتر ئـەژیان وخۆشگوزەران بوون.

ئەوە بوو خوای گەورە لەبەر خۆڕاگری و وەفاو دڵسۆزیی و بەئەمەکی و نەرم و نیـانیی و سـۆزو خزمـەتکردنی بێوێنـەی خێزانـی لـەکاتی نەخۆشـی و ئـەو بـەلاو مەینەتییەی کە هات بەسەریاندا، خوای گەورە فەرمانی کرد بەحەزرەتی ئـەیوب کـە

لەبری ئەو (سەد) تولەی کە سوێندی خواردبوو مادام ژنەکەی لەبەردەم وەسوەسەی شەیتانا لاوازبووە، سویندبێت ئەگەر چاك بویەوە (سەد)تولی لێبدات، بۆیە خوای گەورە فەرمانی کرد بەحەزرەتی ئەیوب کە باقەیەك پوش (سەد)تولّ بێت بیگرێ بەدەستیەوە و بیکێشێ بەژنەکەیدا لەبەرئەوەی ئازاری پێنەگات. ئەویش لەبەر سوێند،کەی چونکە بەڕاستی خۆی وخێزانەکەی زۆر بەئارام و لەخواترس بوون بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثاً فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِراً نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾ ص:٤٤، وە لە پاداشتی ئەو ئارامیی و خۆگرییە خوای پەروەردگار (٢٦) کوڕی پێبەخشییەوە یەکێك لەو کوڕانە ناوی (بیشر)بوو خوای گەورە هەڵیبژارد کردی بەپێغەمبەر ناونرا بە (ذالکیفل). هەندێ لەمێژوونوسان دەڵێن: حەزرەتی ئەیوب لەناو گەلی ڕۆمدا بوو خوا ناردی بۆسەر قەومی ڕۆمەکان.

ئەمەیە بەروبومی خۆڕاگریی و ئارامیی وخواپەرستی و ئارام گرتن لەسەر ناڕەحەتییەکانی ژیان.. ئەم چیرۆکە بۆ ئێمەی باوەڕدار، تا پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرین و هەمیشە لەکاتی ناڕەحەتی‌دا بیر لە پێغەمبەران بکەینەوە، چۆن توشی ناڕەحەتی و گرفت ودژواری ژیان دەبن و چۆن لەسەر ئارامی، سەرکەوتنی ژیان بەدەست دێنن.

ئەمەبووکورتەیەك لەژیانی خێزانە بەئارام و باوەڕدارەکەی حەزرەتی ئەیوب(سەلامی خوای لەسەربێت) بەهیوای ئارامیی و خۆڕاگری بۆ هەموو لایەك.

(٥)



# شاژنە بەلقیس
## خیزانی حەزرەتی سلیمان (سەلامی خوای لیبیت)

هیشتا بەتەواوەتی ڕۆژ نەبووبوویەوە کەمیك دنیا تاریك بوو، لەخەودا بوو لەکاتیکدا لەخەو ڕاپەڕی. یەکسەر خۆی ئامادەکرد و لەگەڵ دەست و پیوەندەکەی و سەربازەکانی کە بڕۆن بەرەو پەرستگای ڕۆژ (معبد الشمس) لەزەوی (مەئرەب)کە بەدووری سی میل لە (سەنعا)وە دوورە ، و گەلی (سەبەء) ڕۆژیکیان لەناو ڕۆژەکانی ساڵدا دیاری کردبوو زۆر لایان پیرۆزبوو، لەوڕۆژەدا ئەچون کڕنوشیان بۆ ڕۆژ ئەبرد و چالاکی زۆر گەورەیان ئەنجام ئەداو قوربانییان ئەکرد بۆ پیشوازی کردن لە ڕۆژ، و چاوەڕوانی هەڵهاتنی ڕۆژیان ئەکرد کە کاتی دەرکەوت یەکسەر کڕنوشی بۆ بەرن، چونکە ئەو گەلە بەشاژنەکەشیانەوە لەبری خوا ڕۆژیان ئەپەرست. کاتی ڕۆژ هەڵهات کاهینەکان بانگەوازیان ئەکرد و بانگی خەڵکیان ئەکرد و فەرمانیان پی ئەکردن کەوا کڕنوش بەرن بۆ ڕۆژ. ئا لەو کاتەدا کە دانیشتوانی گەلی (سەبەء) خەریکی کڕنوش بردن بوون بۆ ڕۆژ، بەلام حەزرەتی (سلیمان ) درودی خوای لەسەربیت لەگەڵ سەربازەکانی خەریکی کڕنوش بردن بوون بۆ پەروەردگاری تاك و تەنها کە خوای هەموو جیهانە بیجگە لەو هیچ شتیکی تر شیاوی پەرستن نییە. خوای گەورە لەگەڵ

ئەوەیدا کە حەزرەتی سلێمانی بەپێغەمبەر هەڵبژاردبوو، لەهەمان کاتدا سەروەت و سامانێکی زۆری پێبەخشیبوو وە دەست و پێوەندێکی زۆری هەبوو هەموو کارێکیان بۆ ئەنجام ئەدا و سەرپەرشتی کارەکانیان بۆ ئەکرد و سامانەکەیان بۆ چاودێری دەکرد. پەروەردگار پلەو پایەو کۆشك و مەڕوماڵاتێکی زۆریشی پێ بەخشی بوو، وە هەمووجۆرە باڵندەو گیاندارانی خستبووە ژێر دەستەلاتیەوە بەفەرمانی سلێمان دەجولانەوە، وە زۆرێك لە (پەری) لەژێر دەستەلاتی سلێماندا بوو، هەرچی بویستایە بۆیان ئەکرد. حەزرەتی سلێمان کردبوویە پیشەی خۆی ناوبەناو هەموو سەربازو باڵندەکان ئەوانەی کە لەژێر دەستیابوون هەمووی کۆئەکردەوەو بەسەری دەکردنەوە و لەگەڵیاندا وت و وێژی لەگەڵ دەکردن، هەرکارێ پێویستی بکردایە لەگەڵیان دەچوو بۆ جێبەجێ کردنی و سەفەری لەگەڵ دەکردن. ڕۆژێکیان سلێمان یەکێك لەسەفەرەکانی لەگەڵ باڵندەکاندا بوو باڵندەی ( پەپو سلێمانە ) واتە (هودهود)ئەو وەك چاوساغی ئاو بوو بۆیان، لەژێرزەویدا ئاوی دەدۆزییەوە و جنۆکەش شوێنەکەی هەڵئەکەند بۆیان و پێداویستیەکانیان لێ جێبەجێدەکرد. ڕۆژێك ئاویان لێبڕا حەزرەتی سلێمان بۆ ئەو مەبەستە (هودهود)ی بانگکرد کەچی دیارنەبوو، سلێمان توڕەبوو وتی: بۆچی هودهود دیارنییە، من نایبینم، یا خۆی شاردۆتەوە یا بەبێ‌فەرمانی من ڕۆشتووە؟ سلێمان زۆر توڕە بوو هەڕەشەی کرد وتی: ئەگەر هودهود ببینمەوە ئەبێ سزایەکی سەختی بدەم، یان سەری ببڕم یان ئەوەیە ئەبێ بزانم بۆچی چوەو چی ئەکات وە بەڵگەیەکی دروستم بۆ بێنێ:﴿لَأُعَذِّبَنَّهُ عَذَاباً شَدِيداً أَوْ لَأَذْبَحَنَّهُ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾ النمل:٢٢-٢١. ئەوەبوو زۆری نەبرد باڵندەی هودهود گەڕایەوە. حەزرەتی سلێمان بەهودهودی وت: دیارنەبووی لەکوێ بووی؟ لەوەلامدا هودهود وتی: زۆرم پێنەچوو:( فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ)، گوێم لێبگرە بابزانی ئەو ماوەیە لەکوێ بووم و چیم کردووە من لەو ماوەی کە دیارنەبووم شتێکم دەست کەوتووە کە تۆ ئاگات لێنییە، ئەوەش ئەوەیە کە من چووم

بۆ (سـەبە ) لەوێوە هاتومەتەوە ئێستا هەواڵێکی ڕاست و دروستم بۆهێناوی سەبارەت بەژیانی ئەوێ، من لەوێ ژنێکم بینی کە ناوی (شاژنە بەلقیسـە) وخـاوەنی کۆشـك و دەسـت و پێوەنـدو سـەربازو فەرمانڕەوایـەکی زۆرو بـەهێزە هـەموو گوێڕایـەڵی فەرمانەکانی دەکەن و هەموو کارەکانی بـۆ جێبـەجێ دەکـەن بـەڵام بەداخـەوە لـەبری پەرستنی خوا، خۆیی وگەلەکەی (ڕۆژ) دەپەرستن و کڕنوش بۆ ڕۆژ ئەبەن، وە شـەیتان هەموو کارە ناشرینەکانی بۆ جوانکردون و بۆی ڕازاندونەتەوە ڕێگای ڕاست و دروستی لـێ ون کـردون: ﴿فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِـيمٌ وَجَـدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ اللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَـنِ السَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ﴾النمل:٢٢-٢٣-٢٤ ، پاشان حەزرەتی سلێمان گـوێی لەمـەبوو بیری کردەوە لە وتەکانی (هودهود) لـەدڵی خۆیـدا وتـی: ئـەبێ ئەمـە چ گـەل و چـۆن کەسێك بن کە لەبری خوا ڕۆژ ئەپەرستن؟ حەزرەتی سلێمان وتی: ئەبێ بـزانم تـا چـەند ئەم ڕوداوە ڕاستە یاخود بەپێچـەوانەوە؟ ﴿قَالَ سَـنَنظُرُ أَصَـدَقْتَ أَمْ كُنـتَ مِـنَ الْكَاذِبِينَ﴾النمل:٢٧ . سەیرە هودهود بەفیترەتی پاکی زانی نابێ بێجگـە لـەخوا هـیچ شتێك لەسەر زەوی بپەرسترێ وە کڕنوشی بۆببرێت بەبێ ئەوەی هیچ کەس ڕایسپاردبێ یاخود پێی وتبێ، بەڵام ویستی پەروەردگارە ئەبێ لەهەمووکات و زەمانێکدا خەڵکی بانگ خواز و بانگەواز بۆ ئاینی خوا هەبێ. (هودهود) لەم کاتـەدا بەپێویسـتی زانـی ئەم هەواڵە بگەیەنێتە حەزرەتی سلێمان بۆئەوەی زۆر لای سەیربوو پەرستنی شـتێکی دروسـتکراو لـەبری دروسـتکەری گـەردوون. حـەزرەتی سلێمان بـە(هودهـود)ی وت: نامەیەکت بۆ ئەنوسم بیبە بۆ ئەو شاژنە بەڵام زۆر بە وریایی، پاش ئەوەی بردت تۆزێ خۆت دووربخەرەوە بزانە ئەنجامی نامەکە چی یە .

پاشان سلێمان نامەکەی نوسی و (هودهود) بردی بۆ (سەبەء) لەیەکێك لەپەنجەرەکانی کۆشکەکەیەوە بۆی خستە ژورەوە. شاژنە بەلقیس زۆر بەئەدەبەوە نامەکەی هەڵگرت و خوێندییەوە کە نوسرابوو:(انه من سليمان وانه بسم الله الرحمن الرحيم) واتە: لەسلێمانەوە بەناوی خوای گەورەو میهرەبان. بەڵام لەوکاتەدا کە نامەکەی پێگەیشت ئەو لەسەر تەختی پاشایەتی لەکۆشکەکەی بۆحەوانەوەو پشودان ڕاکشابوو بەچاودێریکردنی پاسەوانەکانی:﴿اذْهَب بِّكِتَابِي هَذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ﴾النمل:٢٨، دوای ئەوەی نامەکەی خوێندەوە و تێگەیشت لەنامەکە پیاو ماقوڵان و کاربەدەستانی کۆکردەوەو نامەکەی بۆ خوێندنەوە و پێی وتن: ئەمە نامەیەکە لەلایەن پاشایەکی دەسەڵات دارەوە نێردراوە و بەپێشەکییەکی زۆر جوان و بەڕێزو بەنرخ دەستی پێکردووە کە وشەیەکە یەکەم جارە گوێم لێبووەو بیستومە زۆر تازەیە داوای خواپەرستی ڕاست و دروستمان لێ دەکات، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تەنها خوایەك بین کە خوای هەموو جیهانەو خالقی هەموو بونەوەرانە. جا خەڵکینە گوێبگرن و ئێوەش خۆتان بەگەورە مەزانن، من موشۆرەتتان پێدەکەم و ڕاو سەرنجی ئێوەم مەبەستە بەجوانی و ڕاست و دروست وەڵامم بدەنەوە چونکە من تا بڕیاری ئێوە وەرنەگرم هیچ بڕیارێك نادەم. ئەوانیش وتیان: ئێمە خاوەنی دەسەڵات و هێزو جەنگێکی زۆرین ئەتوانین ڕوبەڕوی هەموو هێزێك ببینەوە و بجەنگین چاوەڕێی فەرمانی تۆین: ﴿قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْراً حَتَّى تَشْهَدُونِ﴾النمل :٣٠-٣١-٣٢ ، لەوەڵامدا بەلقیس وتی: شەڕبکەوێتە هەرشوێنێك ئەو شوێنە وێران ئەبێ خەسارۆمەند ئەبێ و سەربڵندان سەریان شۆڕئەبێ بەڕاستی ئەمە ئەنجامی هەموو شەڕێکە .

بەڕاستی ئەم ڕەوشتەی بەلقیس زۆر جوان بوو کە خۆی هیچ کات بەبێ مشت و مڕ و ڕاوێژ لەگەڵ سەربازەکانیدا هیچ کارێکی نەئەکرد بەتایبەتی لەوکاتەدا کە ئەو ڕاوێژو مشت و مڕکردنە زۆرجوان بوو، سودی گەیاند بە بەلقیس کە فەرمانی خۆی هیچ کات فەرز نەئەکرد بەسەر گەلەکەیدا وە سودی بۆ هۆزەکەشی هەبوو کە بەتێکڕا هەموو گوێڕایەڵی بەلقیسیان ئەکرد، چونکە بەلقیس زۆر ژیرو بەئارام و خاوەن ئەزمون بوو، ئەیزانی هێزو دەستەلاتی حەزرەتی سلێمان زۆرەو ئەگەر بەجەنگ بێن ئەوا ولات و دەستەلاتی زەرەرۆمەند دەبن و تیا ئەچن .

ویستی گەل و ولاتەکەی لەئاسەواری جەنگ و وێرانکاری بەدووربگرێت، وە لەگەڵ ئەوەشا نەیئەزانی سلێمان هەرچی گیاندار و جنۆکەیە لەژێر دەستەلاتیدایە بەلقیس بەقەومەکەی وت: ﴿قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ﴾النمل:٣٤ ، وتی: ئەبێ بەتاقیکردنەوەیەکی ورد سلێمان تاقیبکەینەوە، بزانین تاچەند ڕاستە بەسەلیقە و بیرێکی جوان بیریکردەوە پاشان بەقەومەکەی وت: من دیارییەکی باشی بۆ ئەنێرم بەمە تاقی دەکەمەوە ئەگەر دیارییەکەی وەرگرت کەواتە پاشایەو مەترسی نیەو لەگەڵی دەجەنگین، بەلام ئەگەر وەری نەگرت ئەوە بێگومان پێغەمبەرەو بەهیچ شتێك لێمان ڕازی نابێت بێجگە لەوەی کە شوێن ئاین و باوەڕەکەی بکەوین گەلەکەی تێکرا بەلایانەوە پەسەند بوو، بەڵێ ئینجا بەلقیس دیارییەکی ئامادەکردو بەچەند پیاوێکدا ناردی بۆ سلێمان لەوکاتەدا پیاوەکان گەشتنە لای سلێمان و دیارییەکەیان بۆ هێنا. پاشان سلێمان پێی وتن: ئایا ئێوە دیارییەکتان بۆ هێناوم کە ئەو دیارییەی ئێوە هیچ بایەخێکی ئەو تۆی نییە لەبەرامبەر ئەوەی کە پەروەردگار بەخشیویە بەمن. ئەو هەموو نازو نیعمەتەی کە پەروەردگار بەمنی بەخشیوە بە هیچ کەسێکی تری نەبەخشیوە، بەلام ئێوە دیارە بەم دیارییە ئێوە زۆر دڵخۆشن بڕۆن بەخۆتان و دیارییەکەتانەوە خۆتان ئامادەکەن ئێمە بۆ جەنگ ئامادەین دێین ولاتتان وێران دەکەین سەری سەربەرزانتان شۆڕدەکەین

و لەناوتان دەبەین حەزرەتی سلێمان ئەمەی پێ وتن لەبەرئەوەی ئەیزانی بەلقیس نایەوێ شەڕبکات لەژیری و دانایی تێگەیشتبوو زانی کە نیازی شەڕی نیە زانی بەلقیس ئەیەوێ خۆی نزیك بکاتەوە لێیان و ئەگەر لێیان تێبگات و لەڕاستی ئاینی خوا تێبگات باوەڕدێنێ. بەڵێ کاتێ نوێنەرەکانی بەلقیس بەخۆیان و دیارییەکەیانەوە گەڕانەوە، ئەوکات بەلقیس باش تێگەیشت کە سلێمان پاشا نییە و پێغەمبەری خوایە، بۆیە بەلقیس بۆ جاری دووەم نوێنەری نارد بۆ لای سلێمان پێی ڕاگەیاند کە ئەوان نەیەن ئێمە دێین بۆلایان بەبێ نیازی جەنگ بەڵکو بەنیازی باوەڕهێنان. ئەمجارە بەلقیس فەرمانی کرد بەپاسەوانەکانی چاودێری چاکی کۆشك و سەروەت و سامانەکەی بکەن و هەموو دەرگاکانی کۆشك دابخرێ شاژنە بەلقیس بەخۆی و چەند سەرکردەو ڕاوێژکارێك کەئەڵێن (ژمارەیان:١٢) هەزار سەرکردەبوون، بەرەو باکور ڕۆیشتن بۆلای حەزرەتی سلێمان پێش ئامادە بوون و گەیشتنی بەلقیس حەزرەتی سلێمان ویستی بیسەلمێنێت دەسەلآت و نازو نیعمەتێك کە پەروەردگار بە سلێمانی بەخشیوە خوا بە کەسی تری نەبەخشیوە. پاشان حەزرەتی سلێمان ڕووی کردە سەربازو سەرجەم ئەوانەی لە ژێر دەسەلآتیا بوون وتی کێ ئەتوانێت لە ماوەیەکی کەمدا بەلقیس بە خۆی و کۆشکەکەیەوە بۆم بێنێ بۆ ئێرە پێش ئەوەی خۆی بگات و باوەڕ بێنێت؟ یەکێك لە پەریەکانی کە زۆر بە هێزو بە توانا بوو وتی: من بۆت دێنم پێش ئەوەی لەو شوێنەی خۆت هەستیت. حەزرەتی سلێمان ڕۆژانە دادەنیشت بۆ کارو باری فەرمان ڕەوایی لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ واتە بەنیوەڕۆژ ئەو کارەی بۆ ئەنجام ئەدا، بەلآم حەزرەتی سلێمان ئەیویست زووتر ئەو کارە بکرێت پاشان ڕووی تێکردنەوە وتی: کێ ئەتوانێت زووتر ئەو کارە بکات یەکێك لە بەندەکانی کە ناوەکانی خوای بە جوانی ئەزانی و لێیان تێگەیشتبوو،کە ئەهلی تەفسیر ئەڵێن ئەو پیاوە پیاوێکی باش و باوەڕدارو ڕاستگۆ بوو هەموو ناوەکانی خوای ئەزانی خوای گەورە هەموو زانستێکی پێ بەخشیبوو ناوی(ئاصیفی کوڕی برخیا)بوو لە بەنی ئیسرائیلی یەکان بوو بە

حەزرەتی سلێمانی وت: من لە ماوەی چاو تروکانێکدا ئەم کارە دەکەم ئەویش وتی: باشە، یەکسەر نەوەی کە سلێمان داوای کرد جێ بە جێ کرا بەلقیس بە خۆی و دەسەلآت و ئەفسەرەکانی و کۆشکەکەی یەکسەر ئامادە بوون لە بەر دەمیا بەلآم سولەیمان ویستی جارێکی تر زیرەکی و ژیری بەلقیس تاقی بکاتەوە وتی کۆمەڵێك گۆرانکاری بکەن لە ناو کۆشکەکەی دا لە گۆڕینی شووشەو هەندێك شوێن تا بزانین بەلقیس لە هیدایەت دراوانە یان لە گومرِایانە کاتێك سولەیمان ئەمەی بینی بەلقیس بە خۆی و خشڵ و پارەو سەروەت و سامان و کۆشکی یەوە بە دەستکاری یەوە ئامادەن وەك ئەوەی خۆی ویستی کورِنوشی برد بۆ خوا، فەرموی ئەمە لە نازو نیعمەتەکانی خوایە کە بەخشیویەتی بە من، ئەمجارە لە بەلقیسی پرسی ئایا ئەمە کۆشکەکەی تۆیە؟ ئەویش زاناو ژیر بوو زانی کۆشکەکەیەتی و هەندێ گۆرِانی تیاکراوە وتی بەڵێ وەك کۆشکەکەی منە، ئەمەش وەلآمێکی ژیرانەیە وەلآمێکی راست و دروست بوو چونکە بەلقیس خۆی و گەلەکەی و کۆشکەکەی بینی لەبەردەم سلێماندا هاتوچۆیان دەکردو کۆشکەکەی خۆی بینی بە کەمێ دەستکارییەوە بۆیە وتی وەك ئەو وایە حەزرەتی سلێمان فەرمووی (هذا من فضل ربي ليبلوني أأشكر أم أكفر) وە هەروەها فەرمووی ﴿قَالَ نَكِّرُوا لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِي أَمْ تَكُونُ مِنَ الَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ﴾ النمل: ٤١ پاشان سلێمان ویستی زیاتر دەسەلآتی پەروەردگار پیشانی بەلقیس بدات کە خوا چ جۆرە نازو نیعمەتیکی بەخشیوە بە سلێمان، ئینجا فەرمانی کرد بە پەرییەکانی کە کۆشکێکی مەرمەرِ و شوشە دروستبکەن و ئاو لەژێریەوە برِوات،کاتێ تەواو بوو فەرمانیان کرد بە بەلقیس وتیان فەرموو برِۆرە ناو کۆشکەکە، لەکاتێکا بەلقیس چووە ژوورەوە وایزانی ئەو ئاوەی لەژێر کۆشکەکەوەیە سەرەکەی نەگیراوە و جۆگەلە ئاوێکی ئاساییە نەیزانی بە شوشە گیراوە، کە چووە ژوورەوە قاچی تەرِ نەبوو چونکە ئاوەکە بە شوشە سەری گیرابوو ئەمجا بەلقیس زۆر سەرسام بوو، پاشان پێیان وت ئەمە ئاوە داپۆشراوە بە بەردی مەرِمەرِی روون و لە شووشەی ساف

و بێ گەرد، ئەمجارە بەلقیس ووتی ئەی خوایە من زوڵمم لە خۆم کردووە ئەم ماوەیە کە تۆم نەناسیوەو کورنوشم بۆ نەبردووی کورنوشم بۆ غەیری تۆ بردووە کە ئەویش(ڕۆژە) کە دروست کراوی تۆیە ئەوا من باوەڕم هێنا بە پێغەمبەرایەتی سلێمان و لەگەڵ سلێمان دا خواپەرستی دەکەم و باوەڕم هێنا بە خوای هەموو جیهان﴿قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾النمل:٤٤

ئەمەیە شاژنە بەلقیس ژیرو زاناو نەرم و نیان و خاوەن دەسەڵات و هۆشیاری کە بە ڕاستی ژیرو دانا بوو بە دوای ڕاستی دا دەگەڕا بۆیە بەبێ دوودڵی باوەڕی بە یەکتاپەرستی پەروەردگار هێناوە بە هەموو لێهاتووییەوە هیچ کات کاری سەربەخۆی نە ئەکرد تا ڕاوێژی نەکردایە بە کاربەدەستانی، بە بۆچوونی هەموو لایەك بڕیاری دەردەکرد، لەو کاتەدا خانمێك یاسای دادپەروەری و دیموکراتی دەبرد بەڕێوە کاتێك ڕاستی و دروستی بۆ ڕوون بۆوە، توانای خوای بۆ دەرکەوت کتوپڕ باوەڕی هێناو گەردنی کەچ کرد بۆ فەرمانی سلێمان کە ئەویش فەرمانی خوای میهرەبانە ئەو ماوەیەش کە مایەوە مەبەستی ئەوە بوو بە لێزانی و بەدانایی خۆی و گەلەکەشی بەبێ دوودڵی باوەڕ بهێنن. بەلقیس شاژنی(سەبەء)کچی(شەڕاحیل کوری مالیکی کوری ڕەیان) توانی دەسەلاتی گەلەکەی بەرێت بەڕێوە زۆر بە باشی و زیرەکی و لێهاتووی و دانایی دوای کوشتنی پاشاکەیان، کە ناوی(عەمری کوری زی ئەزعار)بوو، قەومەکەی ئەویان هەڵبژارد کە ببێ بە پاشای(سەبەء)و ببێ بە پاشایان و کاری ولاتی پێ بسپێرن پردی مەئرەبی(سد المأرب)ی نۆژەن کردەوەو کۆشك و تەلاری زۆر جوان و ڕازاوەی لە مەئرەب دروست کرد لە کاتی فەرمانڕوایی ئەودا کشتوکاڵ و بازرگانی زۆر پێشکەوتوو بوو بەمەش سەروەت و سامانی ولاتەکەی زۆر بوو بۆیە ژیانیان زۆر باش بوو ئارامی و ئاسایش دەستی گرتبوو بەسەر دانیشتوانی

دا، هەر چۆن باسی ئەو شاژنە دانایە بکەین تەواو نابێت پێشتر خۆی و گەلەکەی ڕۆژیان ئەپەرست، سەر لێشێواو بوون لە ڕووی باوەڕەوە، بەڵێ ژیانیان خۆش بوو بەلاّم لە ڕووی باوەڕەوە زۆر سەرلێ شێواو بوون، پاشان لە ڕێگەی هودهودەوە پاشان لە ڕێی سلێمانەوە خوای گەورە یارمەتی دان و هیدایەت دران، بە خۆی و گەلە کەیەوە ڕوویان لە خوا پەرستی و یەکتاپەرستی کرد پاشان لەگەڵ حەزرەتی سلێمان ژیانی هاوسەریان پێك هێناو بە یەکەوە ژیانیان بەسەر برد منداڵێکیان بوو هەر بە منداڵی مرد، وە ئەم شاژنە خێزانی حەزرەتی سلێمان بە ژیانێکی سەربەرزی و پڕ لە باوەڕ تا ماوەی چەند ساڵێك ژیانی گوزەران پاشان ڕوحی پاکی سپاردەی پەروەردگار بویەوە و وەفاتی کرد لە شاری(انطاکیة) سپاردەی خاك کرا ڕوحی پاکی گەیشتە لای پەروەردگاری دلۆڤان و بە بە هەشتی نە بڕاوە شاد بوو کە لە کۆشکەکەی خۆی و سلێمان خۆشترو ڕازاوە ترە، پەروەردگار لەبەر خاتری ئەو جوامێرانە لە ئێمەش خۆش ببێت...ئامین.

(٦)



# ئاسیای کچی موزاحیم

## خێزانی فیرعەون

ئـەم خاتونـە بـەڕێزە شـاژنێك بـوو لەکۆشـکی پاشـایەتیدا ئـەژیا و ژیـانی ئەگوزەراند، هەرچییەکی بویستایە و ئارەزووی بکردایە بۆی ئامادە دەکـرا، ئـەیبینی ڕۆژانـە چـەنەها کەسـی فـەقیرو هـەژار لـەناو کۆشـکی مێردەکەیـدا بەدەسـتی دارو دەستەکەی دەچەوسێنرێنەوە بەناشرینترین شێوە مامەڵە لەگەڵ خەڵکیـدا دەکرا،بـەڵام ئەم شاژنە بە بـاوەڕبوون بەپـەروەردگار دڵ و دەروونـی ڕوونـاك بووبوویـەوە بـە جـۆرێ چاوەکانی ڕوناکی و پرشـنگی بـاوەڕ تیایـدا ئەدرەوشـایەوە هەمیشـە لـە پـەروەردگار ئەپاڕایەوە کە ڕزگاری بکات لەو ژیانە سەخت و دژوارە خواوەندی میهرەبـان نزاکـەی لێ وەرگرت و بوو بە یەکێ لەوخانمانەی کە هەڵبژێراوی ناو ژنانی هـەموو جیهانـە لـە لای پەروەردگار ئەوەتا خوای گەورە بە نمونـە بـۆ کەسـانی بـاوەڕدار باسـیان دەکـات، لەکاتێکدا زۆر بەکوڵ لە پەروەردگار پاڕایەوە ئەیوت ئەی پەروەردگارم لەلای خۆت لە بەهەشت دا ماڵێکم پێ ببەخشە و ڕزگارم بکە لە فیرعەون و دارو دەستەکەی و زوڵـم و ستەم وکار و کـردەوە ناشـرینەکانی ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِّلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فِرْعَوْنَ إِذْ

قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾التحريم/١١ وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ کە باس لە ئافرەتان دەکات ئافرەتانی مەردو پایەدار لە بەهەشتدا ناوی ئاسیای کچی مزاحیمیش دەبات بەڵێ ئاسیای خێزانی فیرعەون باشترین ژنی باوەڕدارە کە خوای گەورە باسی کردووە لە قورئاندا کە ژنێکی بەوەفاو ڕاستگۆو باوەڕدار بووە لەگەڵ خواوەندا .

چونکە کاتێ ڕاستی بۆ دەرکەوت و دینی ڕاستی بینی بەبێ ترس و دڵە ڕاوکێ شوێنی کەوت و باوەڕی پێ هێنا، بەبێ ترس لە دەسەلاتی فیرعەون و فەرمان ڕەوایانی لەکاتێکدا مێردەکەی داوای لە گەلەکەی دەکرد بیپەرستن و کڕنوشی بۆ بەرن و فەقیرو هەژاران لەکۆشکەکەی مێردەکەیدا ئەچەوسانەوەو ئازاریان ئەچەشت بەلام ژنەکەی خۆی کە نزیکترین کەسیەتی باوەڕی بە پەروەردگاری ڕاستەقینە هەیە نەك خوا دروستکراوەکانی دەستی مرۆڤ .بەڕاستی ئیمانێکی ئەوەندە پتەوو قایم لەدڵی ئاسیادا چەسپیبوو بە هیچ جۆرێ هەڕەشەو ئازارو نارەحەتی و تۆقاندنی فیرعەون کاریگەری لەسەر دروست نەدەکر تافیرعەون و دارو دەستەکەی هەڕەشەیان بکردایەو ئازاریان بدایە ئەم زیاتر خۆشەویستی خواو دینی ڕاستی لە دڵیدا ئەچەسپی و دژی ستەم و بێ باوەڕی دەجولایەوە بەڕاستی بازرگانی یەکی جوانی کرد لەگەڵ خوای خۆی دا کە کۆشکی فیرعەون و دونیای فرۆشت لە پێناو کڕینی کۆشکی بەهەشت.هەموو ژیان و خۆشی دونیا لە لای زۆر بێ ماناو بێ سود بوون بەلام قیامەت و دوا ڕۆژ لە لای جێگای گرنگی دان و بایەخ بوو لەو هەموو ژیانە خۆشەدا دەژیا هەرچی بویستایە لە بەردەمیا ئامادە بوو بەلام کە دینی ڕاستی بۆ دەرکەوت زانی کە هەمووی بڕاوەیەو هەمووی تەواو دەبێت تەنها دینی خواو قیامەت کۆتایی نی‌یە وازی لە هەموو ئەو نازو نیعمەتە هێنا لەبەر خاتری پەروەردگار، بەڕاستی بازرگانی یەکی چاکی کرد لەگەڵ پەروەردگارا دونیای فرۆشت بە قیامەت بەڕاستی قازانجێکی بێ وێنەی کرد لەو بازرگانی یە چونکە هەرچی کۆشك و ڕێزو پلەو پایەو دەسەلات و

دەست و پێوەند و نازو نیعمەتی فیرعەونە فرۆشتی بە قیامەت، بە کۆشکێك لە بەهەشت و بەو هیوایەی یەکێك لە پێغەمبەران ببێتە هاوسەری لە قیامەت دا بە ڕاستی ئەوەش بەلەزەت ترین و جوانترین شتە بۆ مرۆڤ کە لە قیامەت دا خاوەنی کۆشکێکی بەهەشت بیت و خێزانی یەکێك لە پێغەمبەران بیت ئەمەش نازو نیعمەتێکی باوەڕدارانە لە ڕۆژی دوای دا، لە چیرۆکی حەزرەتی موسادا بە جوانی باس لەو خانمە باوەڕدارە دەکرێت وە دەسەلاتی پەروەردگار بەدی دەکرێت لە ژیانیدا، ئەوەتا لە باسی چیرۆکی حەزرەتی موسادا(علیە سلام) باس لەوە دەکات کە کاتێ خوا ئەیخاتە دڵی دایکی حەزرەتی موسا، کاتێ موسا لە دایك بوو لە ترسی ئەوەی کە دەست و پێوەندەکانی فیرعەون کوڕەکەی سەرنەبڕن چونکە بە بڕیارێکی فیرعەون لە ترسی خەونێك کە بینیبوی بڕیاری دا بەوەی لەو ساڵەدا هەرچی کوڕ لە دایك بێت ئەبێت بیکوژن، ئەوەبوو خوای گەورە دایکی حەزرەتی موسای ئاگادار کردەوە کە تێر شیری بداتێ و بیخاتە ناو سندوقێکی قەپاتەوە پاشان فڕێ ی بداتە ناو ڕووباری نیلەوە چونکە ماڵیان نزیك بوو لە ڕووبارەکەوە پاشان ئاوەکە بردی تا گەیشتە کۆشکی فیرعەون لەوێ وەستایەوە لە لێواری ڕووبارەکە پاسەوانەکانی فیرعەون گرتیان و بردیان بۆ کۆشکی فیرعەون کاتێك ئاسیا چاوی کەوت بەو منداڵە جوانە شیرە خۆرەیە یەکسەر خوای گەورە خۆشەویستی موسای خستە دڵی ئاسیاوە پاشان فیرعەونیان ئاگادار کردەوە کە وا منداڵێك لە ناو سندوقێك دا هاتۆتە ناو کۆشکی فیرعەون و کوڕیشە فیرعەون هات بۆ ئەوەی یەکسەر فەرمان بدات کە بیکوژن چونکە بڕیاری داوە لەو ساڵەدا هەرچی کوڕێك لە دایك بێت ئەبێت بکوژرێت چونکە لەو ساڵەدا هەر کوڕێك لە دایك بێت ئەبێت بە پێغەمبەر و فیرعەون لەناو دەبات بەلاّم کاری خوا زۆر جێگای سەرسوڕمانە مرۆڤ زۆر لێ ی تێ ناگات ئاسیا داوای کرد لە فیرعەون کە نەیکوژێت چونکە ئاسیا منداڵی نەبوو وتی مەیکوژە دەیکەینە کوڕی خۆمان بەڵکو ببێت بە ڕووناکی دڵی هەردووکمان و لێ ی سودمەند بین .فیرعەون وتی بەرچاوی تۆ

ڕووناك دەكاتەوە بەلاّم من سوودی لیّ وەرناگرم، بەلیّ فیرعەون وازی لیّ هیّناو نەیكوشت خوای گەورە بەو شیّوەیە خستیە ناو كۆشكی فیرعەون و لە مالّی فیرعەون گەورە بوو ژیانی بردە سەرو چاودیّری دەكرا لە لایەن پاسەوانەكانی یەوە ئا لەو كاتەدا دایكی مووسا لە تاو جگەرگۆشەكەی كە بیستی دەست فیرعەون كەوتووە خەریك بوو نهیّنی یەكە ئاشكرا بكات چونكە پەروەردگار ئاگاداری كردبویەوە كە مندالّەكەت بۆ دەگیّڕینەوە دەیكەینە پیّغەمبەرو دەبیّتە دوژمنی فیرعەون ودەست و پیّوەندەكەی وە لەسەر مەسرەف و چاودیّری ئەو خۆت بە خیّوی دەكەیت چونكە ئەمە ئەو منالّەیە كە فیرعەون بە دەستی ئەو لەناو دەبریّت وە ئاسیا نەیهیّشت لە ناوی ببات كردی بە كوڕی خۆیان و كەس نەبوو شیری بداتیّ شیری كەسی نەئەخوارد زۆریشی برسی بوو لە تاوا دەگریا، شیری كەس ناخوات بیّجگە لە دایكی خۆی سەیرە دەسەلاّت و كاری پەروەردگار چۆن مرۆڤەكان نكۆلّی لیّ ئەكەن لە كاتیّك دا كارەكانی پەروەردگار هەمووی جیّگای تیّ ڕامان و سەر سامی یە تەواوی ئەم ڕووداوە لە ژیانی دایكی حەزرەتی موسادا دەخویّنینەوە﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوّاً وَحَزَناً إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ ﴾القصص:٧-٨ .

ئاسیا خاوەنی ژیری و ئەقلّیّكی فراوان بوو خاوەن دلّ و دەروونیّكی فراوان و ناسك بوو بە جۆریّك شەیتان و فرت و فیّلّ و زولّم و زۆری فیرعەون و دەست و پیّوەندەكەی كاریان لە باوەڕو بیرو بۆچونەكانی نەئەكرد بەڕاستی ئەیزانی میّردەكەی لەو پەڕی لوت بەرزی و لە خۆبایی بووندایە ئەلّیّت من خوام، نەك باوەڕی پیّ نەئەكرد بەلّكو زۆر بە ناڕاست و سەر لیّشیّواو و درۆیەكی زۆربیّ ویّنەی ئەزانی، كاتیّك موسا گەورە بوو چوو بۆ(مەدیەن) لەتاو زەبرو زەنگ و هەڕەشەی فیرعەون و سەربازەكانی، پاشان كە گەڕایەوە بۆ مصر، كە شویّنی لە دایك بونی خۆی بوو، خوا فەرمانی پیّكرد

که ڕێگای ڕاست و دروست بگەیەنێتە فیرعەون و گەلەکەی، خوا کردی بە پێغەمبەرو وە یەکەم کەس کە باوەڕی پێهێنا ئاسیای کچی مزاحیمی خێزانی فیرعەون بوو.بێ هیچ دڵە ڕاوکێ و ترسێ چونکە باش بۆی ڕوون ببویەوە کە ئاینی موسا ئاینی حەقەو باوەڕو داواکانی فیرعەون ناڕاستەو دوورە لە ڕاستی یەوە،کاتێك فیرعەون ئەمەی بیست زۆر ڕقی هەستاو هار بووبوو دەیوت چۆن ئەبێت هاوسەرەکەم باوەڕ بهێنێت بە خوای موسا، وای لێهات ئەوەندە ئازاری چەشت و بێ تاقەت بوو بەو هەواڵە کەوتە ئازاردان و هەڕەشە کردن لێ ی بە جۆرێك کە وای لێ بکات پەشیمان ببێتەوە و واز لە دینی موسا بهێنێ و بگەڕێتەوە سەر دینی مێردەکەی.فەرمانی دا دەست بکەن بە لێدان و ئازاردانی بە جۆرێك ناڕەحەت بێت و پەشیمان ببێتەوە بەڵام ئەو خوای بەڕاستی ناسیوەو ئازارو ئەشکەنجەدان کاری تێ نەئەکرد بەردەوام بوو لەسەر باوەڕە پتەوەکەی بەرگەی هەموو ناخۆشی یەکی ئەگرت.فیرعەون فەرمانی دا کە دەست و قاچی ببەستنەوە و بە شوڵ لێی بدەن،خێرا دەست و پێوەندەکەی ئاسیایان بە دەست و قاچ بەستراوی‌یەوە بە دارێکەوە بەستەوەو کەوتنە لێدانی بە جۆرێك کە زۆر دڕندانە ئەو کارەیان ئەنجام دەدا، بەڵام ئاسیای باوەڕ جوان هەرگیزپەشیمان نابێتەوە لە باوەڕی بە ئاینی موساو بە خوای تاك و تەنها زۆریان لێدا خوێن بە قاچەکانی دا ئەهاتە خوارەوە، ئەوەندەیان لێدا تەنانەت جەلادەکانی فیرعەون خۆشیان بەزەیان پیادا ئەهاتەوە بەڵام ئاسیا زیاتر هیوای قایم ئەبوو بە پاداشتی پەروەردگار پاشان فیرعەون فەرمانی دا بە ڕاکێشانی بەسەر زەوی داو بەو قاچ و دەست بەستراوی‌یەوە بەردی گەورەو قورس بیهێنن بیخەنە سەر سکی و وەکو ئاش لەسەر سکی بیسوڕێنن، وایان لێ کرد تەواو ئازاری چەشت وهێزی تیا نەما ئەمجارەیان داوای کرد لە پەروەردگار کە ڕزگاری بکات لە فیرعەون و دەست و پێوەندەکەی و کارو کردەوە ناشرینەکانیان خوای گەورە هات بە هانایەوەو نزاکەی لێ وەرگرت و ڕۆحی پاکی لە لاشەی دەرچوو گەیشتە بارەگای پەروەدگارو گەیشتە ئەو بەهەشتەی کە خۆی داوای کردبوو لە

پەروەردگار.بەڕاستی ئەمەیە باوەڕو ئارامی جوان، باوەڕێکی لە بن نەهاتوو، ئارامی یەکی بێ وێنە لەسەر ئەو هەموو ئەشکەنجەو ئازارو لێدان و سزادانەی کە ئەیچەشت لە پێناو باوەڕو ئیمانە چەسپاوەکەی لە پێناو ڕەزامەندی پەروەردگار، بەڕاستی جوانترین بازرگانی کرد لەگەڵ پەروەردگاردا بەهەشتی دونیای فرۆشت لە پێناو بەهەشتی پەروەردگار بۆیە خوای گەورە گەیاندیە ڕیزی ئەو ئافرەتانەی کە لەبەر باوەڕو ڕەفتارە جوانەکانیان بۆ هەتا هەتایە لە بەهەشتی نەبڕاوەدا بمێننەوە وە پێغەمبەری ئازیز ﷺ چەند جار لە کاتی ناوهێنانی ئەو ژنە باوەڕدارانەی کە لە بەهەشت دا پلەو پایەی بێ پایانیان هەیە ناوی ئاسیای کچی موزاحیمی هێناوە هەزاران درودو ڕەحمەتی نەبڕاوە بۆ گیانی پیرۆزی ئەم خانمە بە ئەمەك و باوەڕدارە.

# (٧)

## دایکی حەزرەتی موسی (علیە السلام)

### (ئەریخای کچی عیمران )

ئەم خاتونە لەناو قیژەو نالّەی ژنێکی دراوسێیان کە جەدرمەکانی فیرعەون کورە کۆرپەلەکەیان لە باوەشی هەلّپرِوکاندبوو سەریان ئەبرِی و ئەمیش لە کاتی کردنەوەی دەرگاکەی و پاش دوورکەوتنەوەی دەنگی پێیان و پێ کەنین و گالّتە جارییان بەو ژنە جەرگ سوتاو و بێ دەسەلاّتە.. دایکی موسا ئەو رِووداوەی بینی زۆر کاری تێ کردو ترسا زۆر بەزەیی بەو ژنە داماوەدا دەهاتەوەو بەردەوام قیژەو نالّەی ئەو ژنە داماوە لە دلّ و هەستی دا دەزرنگایەوە. نەوەی بەنی ئیسرائیل لە میسردا ژیانیان ئەگوزەراند سالاّنێکی زۆر دوورو درێژ بە ژیانێکی پرِ لە ئەندێشەو ئازارو پرِ لە زولم وزۆر ئەچەوسانەوە بە دەستی فیرعەون و دارو دەستەکەی، وای لێ کردبوون لە مرۆڤایەتی کەوتبوون. بە درِندانەترین شێوە ئازاری ئەدان تا وای لێ هات شەوێکیان لە خەوی دا خەونێکی بینی زۆر نارِەحەتی کرد خەریك بوو شێت ئەبوو نەی ئەزانی چی بکات هەرچی ئەو کەسانەی ئەیانزانی رِاڤەی خەون بکەن هەموویانی بانگ کرد تا بزانن ئەمانای ئەو خەونە چی یە. کە هەموویان هاتن خەونەکەی بۆ گێرِانەوە

ئەوانیش پێیان وت: ئەنجامی خەونەکەت ئەمەیە لەمەو دوا منالێك لە نەوەی بەنی ئیسرائیل لە دایك ئەبێت و گەورە ئەبێت دەست دەگرێت بەسەر هەموو سامان و ماڵەکەتدا وە دەسەلاَت و کۆشکت لە دەست ئەچێ و ئاینەکەت دەگۆڕێ بە ئاینێك کە دژ بەم ئاینەی تۆیە. ساڵەکەیان بۆ دیاری کرد و وتیان: لەو ساڵەدا کوڕێك لە دایك ئەبێت دەبێتە دوژمنت ئەویش زۆر ترسا لە پێناو مانەوەی دەسەلاَت و کۆشك و سامانەکەی و ئەوەی هەیەتی لە دەستی نەچێت، هیچی بە خەیاڵدا نەئەهات هەرچی بکردایە زۆر ئاسایی بوو بەس دەسەلاَتەکەی لە دەست نەچێت ئیتر کێ بکوژێت کێ لە ناو بەرێ و چۆن لە ناویان بەرێت ئاسایی‌یە بەس دەسەلاَتی فیرعەون هیچی لێ نەیەت، بڕیاری دا زۆر نامەردانەو دوور لە هەموو سۆزێکی مرۆڤانە بڕیاری دا لەو ساڵەی کە بۆیان دیاری کردبوو هەر کوڕێك لە نەوەی بەنو ئیسرائیل لە دایك ببێت یەکسەر سەری ببڕن و بیکوژن. وڵات و گەلی میسر کەوتنە ژێر ترس و جەورو ستەمێکی زۆر بێ وێنەو دڕندانە شیوەن و قیژەی منالاَن و دایکان لە تاو بە ناحەق سەربڕینی کۆرپەلەکانیان ئەرزو ئاسمانی پڕ کردبوو، وای لێ هاتبوو هەر ژنێك کاتی مندالْ بوونی ئەهات زۆر ئەترساو نەیئەزانی چۆن منالە کوڕەکەی بشارێتەوەو ڕزگاری بکات لە دەستی زۆردارانی فیرعەون.. دایکی موسا سکی هەبوو بە موساوە، کاتی منالْ بوونی هات زۆر شپرزە بوو ئەترسا کوڕ بێت و دەستی جەلادەکانی فیرعەون بکەوێت چونکە ئەو لەو ساڵەدا منالی ئەبێت کە بڕیار دراوە هەرچی کوڕی بێ ئەبێ بیدا بە دەست جەلادەکانی فیرعەون و سەری ببڕن، ئەی خوای گەورە ئەم دایکە بەستەزمانە چیبکات وا کوڕەکەی بوو ئینجا چی بکات، کۆرپەلەی چی زۆر جوان پرشنگی چاوەکانی دڵی مرۆڤی ئەنجن ئەنجن ئەکرد. منالێکی تا بڵێی پاکیزەو دڵرفێن ئیتر چۆن ئەم دایکە دڵی بێت بەبەر چاوی خۆیەوە جەلادەکانی فیرعەون سەری ببڕن بێ بەزەییانە.. هەموو شتێك دەکات لەبەر ڕزگارکردنی منالەکەی هەمیشە بیری ئەکردەوە بە بیرێکی قووڵ تا بزانێت چی بکات بەلاَم ئەم خانمە باوەڕێکی لە بن

نـەهاتووی بـە پـەروەردگار هـەبوو، بـەلاّم وەسوەسـەی شـەیتانیش تـەنها لـە دەوری باوەڕداران زیاتر کار دەکات و ئەیەوێت فریویان بدات بەلاّم دایکی موسا زۆر بـاوەڕی پتەو بوو هەرگیز ڕوخسـەتی شـەیتانی نەئـەدا فریـوی بـدات. لـە کاتێکـدا کوشـتاری کوڕانی بەنو ئیسـرائیل لە لایەن سەربازەکانی فیرعەونەوە ئەوەندە زۆر بـوو لـە ژمـارە دەرچوو ڕۆژ دوای ڕۆژ لە زیاد بوون دا بوو. بە فیرعەونیان وت دەست و پێوەندەکـەی: ئەگەر ئەم کارە ئەوها بەردەوام بێت وای لیّ دێـت کـە ڕێـژەی کـوڕان لـە ولاّتـدا کـەم دەبێتەوەو ئەوەی دەمێنێتـەوە ژن و منـاڵ و پیرەکـانن کـە ئـەوکات وای لیّ دێت لـە ولاّتدا گەنج و لاوی کوڕ نەبیّ، و کارەکانی ولاّتیش تەنها بە ژنـان نـاڕوات بـە ڕێـوەو ولاّتەکەمان تەفرو تونا ئەبێت. ئینجـا فیرعـەون ئـەمری دەرکـرد سـاڵێك هـیچ منـاڵ سـەرنەبڕن بـەلاّم سـاڵی دوای ئـەو هـەر کوڕێـك لـە دایـك بـوو سـەری بـبڕن، ئینجـا جەندرمەو پیاوانی فیرعەون ماڵ بە مـاڵ و شـوێن بـە شـوێن ئەگـەڕان هـەر ژنێکیـان ببینیایە سکی هەبوایە ناوەکەیان لای خۆیـان تۆمـار دەکـردوو چـاوەڕێیان دەکـرد تـا کـاتی منـاڵ بـوونی دوایـی لـەلای مامـانی دیـاری کـراو نەبوایـە منـاڵی ببوایـە، و کوڕەکانیان یەکسەر بەبەرچاوی کەس و کارو دایك و باوکیەوە سەریان دەبڕی، بـەلاّم ویست و نارەزووی خوا وا بوو دایکی موسا سکەکەی پێـوە دیـار نـەبوو جـەلادەکانی فیرعەون پێیان نەزانی تەنانەت ژنە مامانەکانیش هەستیان پیّ نەئەکرد تـا کـاتی لـە دایك بوونی هات پێیان نەزانی، بەلاّم کاتێك لە دایك بوو ترس و بیّ تاقەتی دایگرت زۆر گریاو پاڕایەوە، تا پەروەردگار بە ڕەحم و بـەزەیی خـۆی دایکـی موسـای ئاگـادار کردەوە فەرمانی پیّ کرد نەترسێت لە سەربڕینی کوڕەکەی چونکە خۆمان ئـەیپارێزین فەرمانی پیّ کرد سنوقێك دروست بکات هەر کات ترسی ئـەوەی هـەبوو پـیّی بـزانن تێر شیری بکات و بیخاتە ناو سنوقەکەوە، پاشـان سـندوقەکەی قـایم بکـات و فرێـی بداتە ناو ڕوباری نیلەوە. ئەوە بوو دایکی موسا بەباوەڕە جوانەکـەی ئـارامی گـرت و هۆشی هاتەوە کە خوای گەورە لە بەڵێن و پەیمانی خۆی پەشیمان نابێتەوە دڵنیـا بـوو

لـەوەی کـە کوڕەکـەی چـاودێری ئـەکات و دەیپارێزێـت. زۆر دڵخـۆش بـوو ئینجـا سندوقەکەی دروست کردو ئامادەی کرد بۆئەوەی هەرکاتێك جەلادەکان نزیك بوونـەوە کۆرپەکەی بخاتە ناوی و بیخاتە ناو ڕووبارە کەوە لەسەرفەرمانەکەی خوا چەند جارێك کە نزیك ئەبونەوە لەماڵیان منداڵەکەی تێر شیر دەکردو دەیخستە ناو سندوقەکەو بەپەتێك شەتەکی ئەداو پەتێکی پێوە ئەبەست و فڕێی ئەدایە ناو ڕوبارەکەوە،تادور دەکەوتنەوە ئینجا دەچوو دەیهێنایەوە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴾القصص:٧ . بەڵێ وەك خوا بەڵێنی پێدابوو خۆمان دەیپارێزین وە دەیگێڕینەوە بۆلای خۆت و دەشبێت بە پێغەمبەر .

وەك خوای گەورە فەرمانی پێکردبوو هەرکات ترسا تێرشیری بکات و بیخاتە ناو سندوقەکەوە و بیخاتە ناو ڕوباری نیلەوە چونکە ماڵی موسا لە لێواری ڕووبارەکەوە نزیك بوو دایکی موساش هەرکات بترسایە ئەوکارەی دەکرد، بەڵێ ڕۆژێك سەربازەکان نزیك ماڵیان بوونەوە، لەشپرزەییدا تێرشیری کردو خستیە ناوسندوقەکەوە و لەبیری چوو لە شپرزەیی و لەترسانا وەکو جاران حەبلەکەی پێوەبەسێ و سەری حەبلەکەلای خۆی قایم بکات، سندوقەکەی فڕێدایە ناوئاوەکەوە. ئاوبردی تا گەیشتە بەردەم کۆشکی فیرعەون لەبەردەم کۆشکی فیرعەون سندوقەکە وەستایەوە چونکە ویستی خوا وابوو سەربازەکانی فیرعەون چاویان پێکەوت خێرا چون سندوقەکەیان هێنا بۆلای خێزانی فیرعەون لەکۆشك، لەوکاتەدا کە سەری سندوقەکەی کردەوە (ئاسیای کچی مزاحیم )کە خێزانی فیرعەون بوو. کە ئاسیا چاوی پێکەوت یەکسەر خۆشەویستی ئەو منداڵە لەدڵیدا چەسپی و زۆر سۆزی بۆ پەیدا بوو لەبەرئەوەی خێزانی فیرعەون منداڵی نەئەبوو. یەکسەر خوای گەورە خۆشەویستی ئەو منداڵەی خستە دڵیەوەو بەمێشکیا هات کەئەو منداڵە بەهەرشێوەیەك بێت بیکاتە منداڵی خۆی و لەسایەیدا بحەوێتەوە. وە هەواڵەکە خێرا گەیشتە فیرعەون کە منداڵێك

کوڕەو شیرە خۆرەیە لەسندوقێکدایەو لەناو کۆشکی فیرعەوندا وەستاوەتەوە. خێرا هات و فەرمانی دا بەسەربازەکانی سەری ببڕن. ئاسیای کچی مزاحیم داوای لەفیرعەونی هاوسەری کرد کەسەری نەبڕێت و بیکەنە کوڕی خۆیان لە دوارۆژدا سودی لێ وەرگرن بەڵکو ببێتە ڕوناکی ژیانیان.

هەرچۆنێك بوو فیرعەونی ڕازیکرد کەوازی لێبێنێت و سەرینەبڕێت. فیرعەون لەوێدا یەکسەر بەژنەکەی وت: ڕەنگە ببێتە ڕوناکی ژیانی تۆ بەلام هەرچی تەماشا دەکەم بۆمن هیچ سودێکی نابێت . بەلام بە ویستی پەروەردگار نە فیرعەون نە دارو دەستەکەی هەستیان بەوە نەکرد کە دەبێتە دوژمنیان و لەناویان دەبات .

﴿وَقَالَتِ امْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَى أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَداً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾القصص:٩. لەم ڕوداوە سەیرو سامناکە خەریك بوو دڵی دایکی موسا ببچڕێ کە بیستی وا ئاوەکە سندوقەکەی بردە کۆشکی فیرعەون و مناڵەکەی دەست جەلادەکانی فیرعەون کەوتووە. ڕەحم و سۆزو خۆشەویستی دایکی موسای وا لێکردبوو تەواو شپرزە و بێ هیوا بوو، هیوای نەما بە مناڵەکەی وتی: تەواو مناڵەکەم کەوتە دەستیان و سەری ئەبڕن، بەلام ئەمە وەسوەسەی شەیتانە چۆتە دڵیەوە و سۆزو خۆشەویستی دایکایەتیش تەواو زاڵ بووبوو بەسەریدا، بەلام پەروەردگار خۆی بەڵێنی داوە هەرنەبێ بیگەڕێنێتەوە بۆدایکی و بیپارێزێت و ئەشیکاتە پێغەمبەر. ئەوەبوو لەکاتێکدا دایکی موسا کەزانی جەلادەکانی فیرعەون بەرەو ماڵیان ئەڕۆن و خەریکە نزیك ئەبنەوە لەشپرزەییدا تێرشیری کردو جوان پێچایەوە و خستیە ناو سندوقەکەوە و بەحەبل پێچایەوە و فڕێیدایە ناو ئاوەکەوە بەلام لە شپرزەیdدا لەبیری چوو سەری حەبلەکە بەو شوێنەوە ببەستێتەوە کە هەموو جارێ ئەو کارەی دەکرد، و سەری حەبلەکەی بەدارێکەوە دەبەستەوە بەلام ئەمجارەیان فەرمانی خوا وابوو لەبیری چوو بەدارەکەوە سەری حەبلەکە ببەستێتەوە، ئاوەکە مناڵەکەی برد لەوکاتەدا زۆر ترساو شپرزەبوو وا مناڵەکەی لەناو سندوقەکەدا

سەرئاوەکە کەوتووە و دوورکەوتەوە تازە لەدەست چو. خێرا بەکچە گەورەکەی وت: واتە خوشکەکەی موسا بچۆ شوێنی کەوە و بزانە چی لێ دێ بەلاّم بەجۆرێ کەس پێت نەزانێ.. ئای لەدڵ و دەروونی ئەم دایکە دڵ هەڵقرچاوە ئەم دایکە داماو و بەستە زمانە، کۆرپەی شیرین و شیرە خۆرەی بەدەستی خۆی دای بەدەم ئاوەوە ئەگەر خوای گەورە یارمەتی نەدایەو هیوای گەورەی بەدەستەلاّتی پەروەردگارو بەڵێنی پەروەردگار نەبووایە کە پێی فەرموو: بۆت دەگەڕێنینەوە، زۆر ناڕەحەت دەبوو لەوەش ئەچوو بمردایە و دڵی بەرگەی ئەو هەموو ناڕەحەتییەی نەگرتایە. وە ئەگەر لەباوەڕداران نەبووایە و خوا یارمەتی نەدایە لەوە ئەچوو کارەکەی ئاشکرا بووایە لەتاو هەڵقرچاندنی دڵی: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغاً إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَن رَّبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ و قَالَتْ لِأُخْتِهِ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾القصص:١٠-١١، بەڵێ کاتێ خێزانی فیرعەون موسای بینی زۆر دڵی پێ خۆش بوو بەجۆرێك زۆر شیرین بوو لەدڵیا، بەلاّم منالّی شیرە خۆرە هیچ ناخوات بێجگە لەشیر. زۆر برسی بوو زۆر گریا تەواو بێئارام بوو لەبرساندا وە شیری کەس ناخوا بێجگە لەشیری دایکی خۆی. ئەمەش یەکێکی تر لە کارە جوانەکانی پەروەردگار هەرچی ژنی شیردەربوو هێنایان ئەوانەی کەوا لەناو کۆشکی فیرعەون دا بوو، شیری کەسی نەئەخوارد و هەر ئەگریاو ئەکروزایەوە لەبرسا. ئاسیا وای لێهات لە دەرەوەی کۆشك ئەگەڕا بەدوای یەکێکدا کە موسا شیری بخوات و ژیر ببێتەوە، بەلاّم بێسود بوو شیری کەسی نەئەخوارد، زۆر ماندوو بوون سەرجەم دەست و پێوەندەکانی فیرعەون و ئاسیا کەسێك نەما نەیهێنن لەناو ئەوانەی کە شیردەربوون تا موسا ژیر ببێتەوە کەسیان دەست نەئەکەوت. ئا لەوکاتەدا خوشکەکەی موسا کە ناوی (تومصا) بوو خۆی ئاشکرا نە کرد کە خوشکی موسایە (علیه السلام ) پێ ی وتن: من ژنێك شك ئەبەم زۆر باشە و زۆر فەقیرە دەست پاك و دەم پاکە زۆر پاکیزەیە پێموابێ شیردەرە، وە زۆر دانا و ژیرە پێ ئەچێ ئەگەر بانگی کەن لەوە ئەچێ بزانێ

چۆن ئەم منالە ژێر دەکاتەوە پاش ئەمە یەکسەر خوشکی موسا بردنی بۆ ماڵی خۆیان بۆ لای دایکی. دایکی پێنیشان دان بەلاّم ویستی پەروەردگار وابوو کەسیان هەستیان نەکرد کە ئەوە دایکی موسایە ﴿ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾القصص:١٢-١٣ ئەمەیە ویستی پەروەردگار فەرمان و قەدەری ئیلاهی کە بییەوێ هەرچییەك بکات ئەیکات، وە چۆن بییەوێت هۆکارەکانی بۆ ڕێك دەخات. بەڵێ کە موسا گەشتەوە ئامێزی دایکی و بەرەو ڕوی سنگی دایکی بوویەوە بەبێ هیچ گرفتێك شیرەکەی گرت و خەوی لێکەوت. چون خێرا مژدەیان دایە خێزانی فیرعەون ئەویش دایکی موسای بانگ کرد زۆر بەرێزو بەجوانی قسەی لەگەڵکردو ماڵێکی زۆری پێبەخشی، بەلاّم خێزانی فیرعەون نەیئەزانی ئەمە دایکی موسایە لەپاشان داوای لێکرد لەکۆشکی فیرعەون بمێنێتەوە بەلاّم دایکی موسا ڕازی نەبوو وتی: من مێردو منالم هەیە ناتوانم جێیان بێلم پێویستیان بەمنە. ئاسیا ڕازی بوو بەوەی کە موسا لەگەڵ دایکی دا ببرێنەوە بۆ ماڵی خۆیان و لەوێ خزمەتی بکات و شیری بداتێ و پەروەردەی بکات و بەخێوی بکات بەلاّم خێزانی فیرعەون پارەو ماڵێکی زۆری دایە و لەگەڵ خۆی بردییەوە بۆ ماڵەوە و لەژێر چاودێری و مەسرەفی لەلایەن خێزانی فیرعەونەوە موسای بەخێو دەکرد. بەم ڕوداوە سەیرو سەرسوڕهێنەرە دایکی موسا زۆر دڵ خۆش و دڵنیا بوو لەپاراستنی منالەکەی بەم شێوەیە موساو دایکی ژیانیان دەبردە سەر لەژێر چاودێری فیرعەون و سەربازەکانی .

پەروەردگار نارەحەتی و دڵە ڕاوکێ و ئێش و ترس و لەرزی بۆکرد بە خۆشی و خۆش بەختیو دڵنیایی، بەهۆی ئەو ئارامی و خۆگریی و باوەڕە بەهێزەی بەپەروەردگار خوا پاداشتی دایەوە .

نێوان خۆشی و ناخۆشی تەنها شەو و ڕۆژێك بوو. پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری توانا و زاناو داناو بەدیهێنەر کە هەموو کارو فەرمانێك بەدەست ئەوەو هەرئەوە ڕزگار کەری هەموو دڵتەنگی و لاوازی و بێنەوایان، هەرئەوە کەسی بێکەسان و پشت و پەنای باوەڕداران .

بەڕاستی دایکی موساش ڕاستگۆو باوەڕدار بوو بەو پەیمان و بەڵێنەی کە پەروەردگار پێی دابوو وەبەو دڵنیاییتەی ئەویش بەپەروەردگار و میهرەبانی پەروەردگار.. هەزاران دروود و ڕەحمەت لەگیانی پاکیزەیی دایکی موسا و سەرجەم دایکی هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام) .

(٨)



# خێزانی حەزرەتی موسا (علیه السلام)

## سەفورەی کچی شوعەیب

ئیبن مەسعود دەڵێ ئەوانەی سەرناسی ڕاست و دروست بوون سیانن: یەکەم: ئەوەی کە یوسفی کڕی بۆ عەزیزی میصر کە ناوی (قەتفیر)بوو کەبەژنەکەی وت: زۆر ڕێزی بگرە ئەمە خاوەنی کەماڵێکی پیرۆزە، دووەمیان خێزانی حەزرەتی موسا کە بە کچێتی بەباوکی وت: باوکە موسا بەکرێ بگرە بۆ چاودێری مەڕومالاتەکەت بەڕاستی کەسێکی بەهێزو ڕاستگۆو دەست پاك و دەم پاکە (یا أبت أستأجره )، سێیەمیان حەزرەتی ئەبوبەکر کە حەزرەتی عومەری هەڵبژارد دوای خۆی ببێتە خەلیفەی موسوڵمانان. خوێنەری ئازیز با بزانین چی وای لەموساکرد میصر بەجێبێڵێ و بەرەو (مەدیەن) لای خوارووی فەلەستین بڕوات و لەوێ کچی پیاوێکی بۆخوا ژیاو بکاتە هاوسەری، (١٠)ساڵ شوانی بۆ بکات. بابزانین ئەمەچۆن ڕوویدا.

موسا لەمیصر دەژیا لەناو زوڵم و زۆری فیرعەون و خەڵکی سەرلێشێواو و بێ باوەڕدا ژیانی ئەگوزەراند. ڕۆژێکیان لەگەرمای نیوەڕۆدا دنیا زۆر گەرم بوو خەڵکی هەموو لەماڵەوە پشویان ئەدا حەزرەتی موسا لەماڵ چووە دەرەوە سەیری کرد

دوو پیاو بەشەڕ هاتن یەکێکیان لە بەرەی حەزرەتی موسا بوو ئەویتریان (قیبتی )بوو لەدەست و پێوەندەکانی فیرعەون بوو. پیاوە قبتیەکە جولەکەکەی بەگیر هێنابوو، جوولەکەکە هاواری لەموسا کرد کە هاوکاری بکات و فریای بکەوێت، (موسا)ش یەکسەر چوو بەدەمیەوە بەنیازی ئەوەی کە لەیەکیان جیا بکاتەوە، شەپازلەیەکی بەهێزی لێدا یەکسەرکابرای (قیبتی) دەست بەجێ مرد. موسا زۆر پەشیمان بوو لەوکارەی چونکە ئەو بەنیازی کوشتن لێی نەدا، وتی: خوایە گیان ئەمەی من کردم کاری شەیتان بوو پێی کردم چونکە شەیتان هەمیشە ڕێگای هەڵەو تاوان پیشانی مرۆڤ ئەدا.

﴿وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَى حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَذَا مِن شِيعَتِهِ وَهَذَا مِنْ عَدُوِّهِ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ فَوَكَزَهُ مُوسَى فَقَضَى عَلَيْهِ قَالَ هَذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ}﴾القصص:١٥

لەڕۆژی دوای ئەوە هەمان کابرای ناسراوی موسا لەگەڵ یەکێکی تر لە میصرییەکان بەشەڕ هاتەوە و هەمدیس بانگی موسای کرد کە یارمەتی بدات وە موساش پێی وت: تۆ هەموو ڕۆژێ شەڕدەکەیت دیارە تۆ کابرایەکی شەڕانی و سەرەڕۆی. موسا بەرەو ڕوی کابرای خزمی و کابرای میصری ڕۆشت، کابرامیصرییەکە پێی وت: ناتەوێ منیش بکوژی وەك ئەوپیاوەی دوێنێ کە چۆن کوشتت. یەکسەر شوێنەکەی جێهێلاو بەخێرایی ڕۆی سەربازەکانی فیرعەونی ئاگادار کردەوە. سەربازەکانی فیرعەون ئەو هەواڵەیان پێگەیشت کەوا موسا پیاوێکی ئەوانی کوشتووە بڕیاریاندا پلان دابنێن بۆکوشتنی موسا (علیە السلام). پیاوێك لەناسراوەکانی موسا ئاگای لەو پلانەبوو خێرا چوو بۆلای موسا و پێی وت: کە فیرعەون و سەربازەکانی بەنیازن بیکوژن. پێی وت: موسا وریابە خۆت ڕزگاربکە موساش زۆر بەپەلە و بەخێرایی میصری جێهێشت و بەدەم پاڕانەوەوە ئەیوت پەروەردگارە من ستەمم لەنەفسی خۆم کردووە داوای لێبوردن ئەکەم و لێم خۆش ببە، خواش نزاکەی وەرگرت و لێی خۆش بوو ﴿قَالَ رَبِّ

إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾القصص:١٦. ئەوەبوو موسا میصری بەجێهێشت و ڕووەو (مەدیەن) لەخواروی فەلەستین بەرێ کەوت، زۆر بەپێ ڕۆیشت هیچ خواردنی پێنەما، خواردنی تەنها سەوزەو ڕووەکی سەرزەوی بوو ماوەی (٧) ڕۆژ بەپێ ڕۆشت ڕێگای بڕی، نەعلەکانی بچڕا ناچار بوو بەپێی پەتی و برسێتی و تونیەتی و هیلاکی ڕێگای ئەبڕی، لەهیلاکیا لەبن دارێکی نزیك سەرچاوەی ئاوی مەدیەن دانیشت تا کەمێ پشووبدات. سەیری ئەو خەڵکانەی ئەکرد کە لەوناوەبوون وا شوان و خاوەن ئاژەڵەکان خەریکن ئاژەڵەکانیان ئاوئەدەن، بەڵام لێرە دا شتێك سەرنجی ڕاکێشا ئەویش ئەوەبوو کە هەریەکە لەشوانەکان ئاژەڵەکانی خۆیان ئاوئەدا لەوبیرەی کە سەرچاوەی ئاویان بوو، بەڵام سەیری کرد وا دوو ئافرەت مەڕو ماڵاتەکەی خۆیان لەشوێنێکی دووری خەڵکەکە وەستاندووەو نایانەوێت ماڵاتەکەیان تێکەڵی ماڵاتی کەس ببێت وە نایانەوێت تێکەڵی قەرەباڵغی بن چونکە تەنها ئەوان ئافرەت لەوێدابوون لەبەر شەرم و حەیای ئەوەی کە تێکەڵ بەپیاوان ئەبن نزیك نابنەوە، ئەمە سەرنجی ڕاکێشا کەوا هەمویان پیاوبوون تەنها ئەو دوانە ئافرەتن، پیاوەکان ڕێگایان بۆ ئاسان ئەکەن و چاودێریان ئەکەن و ڕێزیان لێ دەگرن. موسا خۆی پێنەگیرا و بەرەو ئەوان کەوتەڕێ و لێیان نزیك بوویەوەو پرسیاری لێکردن لەوبارەیەوە، ئەوانیش زۆر بەشەرم و بەئارامییەوە وەڵامیاندایەوە و وتیان: ئێمە ناتوانین مەڕوماڵاتەکەمان ئاوبەین تا هەموویان تەواو نەبن و نەڕۆن نەك تێکەڵ بەوان بین چونکە ئەوان زۆربەیان پیاون، لەترسی ئەوە نەك توشی گوناهببین و لێیان بکەوین، ئێمەش بۆیە خۆمان هاتوین چونکە باوکمان پیربووە و توانای کاری نەماوە موسا یارمەتی دا، خۆی بەتەنها سەری بیرەکەی هەڵدایەوە بەڵام ئەوان بەچەند پیاوێکەوە سەری بیرەکەیان هەڵئەدایەوە موسا زۆر خۆی ئەپاراست لەبینینیان. ئاژەڵەکانیان تێر ئاوبوون و کچەکان ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە و حەزرەتی موساش چوو بۆژێر دارەکە و ڕاکشا و پاڕایەوە لەخوداو وتی: ئەی خوایە من زۆر برسیمە و شەکەت و ماندووم و

ناشارەزام، خوایە گیان بەرەحمی خۆت یارمەتیم بـۆبنێری و زۆر پێویـستم بەیارمـەتی تۆیـە: ﴿فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴾القصص:٢٤. کاتێ کچەکان ڕۆشتنەوە بۆ ماڵەوە باوکی لێی پرسین چۆن بـوو وا ئەمڕۆ زووهاتنـەوە بۆماڵـەوە ڕۆژان درەنگـتر ئەهاتنـەوە؟ ئـەوانیش ڕوداوەکـەیان بـۆ گێڕایەوە وتیان: بەهۆی پیاوێکی ئازاو بەهێزەوە بوو چاکەی لەگەڵ کردین و یارمـەتی داین بێ ئەوەی بیناسین و داوای کرێمـان لێبکـات ئـەو تـەنها لەبـەر چـاکەی خـۆی و پیاوەتی خۆی هاوکاری کـردین. کـاتێ باوکیـان کـە حـەزرەتی شـوعەیب بـوو (علیـه السلام) گوێ بیستی ئەم ڕوداوەبوو داوای لەیـەکێ لەکچـەکانی کـرد کـە بـۆی بـانگ بکەن. کچەکەی حەزرەتی شوعەیب زۆر بەرێزو شەرمەوە چوو بۆلای حـەزرەتی موسـا و پێی وت: کە باوکم منی ناردووە بەشوێن تۆدا کە وا ئەیەوێ پاداشتی ئەو چاکەیەت بداتەوە کەلەگەڵ ئێمەدا کردوتـە: ﴿فَجَاءتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاء قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾ القصص:٢٥ ، موسا وەلامـی داواکـەی بـاوکی کچـەکەی دایەوە و پێش کچەکەی حەزرەتی شوعەیب کەوت. بەئیشارەت کچەکە ماڵی خۆیانی پیشاندا، موسا چووە لای شوعەیب و چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە کـە چـۆن ژیـاوەو چـۆن لەترسی فیرعەون ڕایکردووە پێی وت: مەترسەو بۆ خۆت ئاسودەبە. زۆر دڵی دایەوە و دڵ خۆشی کردو پێ ی فەرموو: ڕزگارت بوو لەو کەسە ستەم کارانە فەرمووی: ﴿لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾القصص:٢٥. یـەکێ لەکچـەکانی زۆر سـەرناس و زیرەك و دانا بوو زۆر جوان خەڵکی ئەناسی زۆر فیترەتێکی پاك و جوانی هەبوو، بۆیە ئاماژەی کرد بۆ باوکی کە ئەمە پیاویکی سەنگین و گونجاوە بۆ ئێمـە.کـە مەبەسـتی موسابوو وتی: باوکـە زۆر پیـاوێکی چـاکە بـەکرێی بگـرە بـا چـاودێری ئاژەڵـەکانمان بۆبکات: ﴿قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ

الْأَمِينُ ﴾القصص:٢٦ بۆیە بەباوکی وت: بەکرێی بگرێ چونکە خۆی و خوشکەکەی زۆر شەکەت و ماندوو بوون، وە ئەیزانی پیاوێکی نەفس بەرزو بەتوانایە چونکە لەیەکەم جارا زۆر ژیرانە هاوکاری کردن ئەمیش زۆر ژیرانە هەڵیسەنگاند. ئەم کچە چونکە زۆر لەخۆی ڕازی بوو ئەیزانی وە زۆر لەخۆی ڕائەبینی بۆیە بەباوکی وت: کە بیکاتە هاوسەری موسا و موساش شوانیان بۆ بکات. وە زۆر بەجوانی قەناعەتی کرد بەباوکی کە موسا پیاوێکی باش و بەتوانا و لێهاتووە و دەست و دەم پاك و داوێن پاکە ئەگەر باوکی ڕازی بێت. بۆیە باوکیشی ڕازی بوو پێی وت: من دەمەوێ لەبری ئەو چاکەیەی کە کردت لەگەڵ کچەکانم یەکێك لەکچەکانمت بدەمێ و بیکەیتە هاوسەری خۆت، بەڵام بەمەرجێ هەشت ساڵ شوانییم بۆ بکەی وە ئەگەر بیشیکەی بە دەساڵ ئەوا مەیلی خۆتە من بۆ ئەو دەساڵە زۆرت لێناکەم نایکەمە بار بەسەرتەوە، لەمەودوا من دەبینی پشت بەخوا کە من پیاوێکی ڕاستگۆو خاوەن پەیمانم لە نێوان من و تۆدا ئەم ساڵانە بێت کە لە پەیمانماندا هەیە کەهیچ کاممان درێغی لەوی ترمان نەکەین، ئەوەی ئەیڵێین خوا لەسەر پەیمانەکەمان ئاگادارە شوعەیب پێ ی فەرموو: ﴿قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْراً فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ قَالَ ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴾ القصص:٢٨ . ئەوەبوو کاتێ حەزرەتی موسا ماوەکەی تەواو کرد واتە ماوەی دە ساڵ کاری بۆماڵی خەزوری کرد، ویستی بگەڕێتەوە بۆمیصر حەزرەتی شوعەیب ڕازیبوو بەوەی کە بگەڕێتەوە و خێزانەکەی کەکچی حەزرەتی شوعەیب بوو بیبات لەگەڵ خۆی و دوعای خێری بۆ کردن. وە لەوکاتەدا کە لەماڵی باوکی بوون کوڕێکی بوو ناوی نا (جەرشوم) بەزمانی ئەوکاتە واتە (ئاوارە). لەوکاتەدا ویستیان بگەڕێنەوە، (صەفورە) واتە ژنەکەی موسا داوای لەباوکی کرد کە بڕێ مەڕی بداتێ بۆ پێداویستی ژیانیان، باوکیشی چەند کاوڕێکی پێبەخشین کە هەمووی یەك ڕەنگ و

یەك تەمەن بوون وە دەڵێن کاتێ حەزرەتی موسا بەعاساکەی لێی دەخورین بوون بەیەك ڕەنگ و لە هەموو نەخۆشییەك پارێزراوبوون. موسا خۆیی و خێزانەکەی بەرەو میصر بەڕێکەوتن، خێزانەکەی و ئەوەی پێیە بەخشرابوو لە مەڕومالآت لەگەڵ خۆیا بردی لەمەدیەنەوە بەرەو میصر. ئەو کاتە زستان بوو بەڕێگا هاتن تا گەیشتنە نزیك شاخی گور، لەکاریگەری سەرماو سۆڵە ڕێگایان لێهەڵە بوو شەو بوو دنیا زۆر تاریك بوو. لەوکاتەشدا صەفورە دووگیان بوو وە سەرما کاری تێکردن، موسا ویستی ئاگر بکاتەوە بەلآم نەیتوانی لەپڕ سەری بەرزکردەوە ڕوناکییەکی بەدی کرد، بەخێزانەکەی وت: لێرە دانیشە ئەوە گڕی ئاگرێکە دەچم یان ڕێگام پیشان دەدەن یان ئاگرێك دەهێنم خۆمانی پێ گەرم دەکەینەوە. بەڕاستی لەڕێگا زۆر توشی نارەحەتی بوون ئەوەبوو ئەو ڕوناکییە ئاگر نەبوو نوری خوا بوو.

ئێمە لێرەدا مەبەستمان صەفورەیە خێزانی موساو کچی شوعەیبە کە بەڕاستی ئازایەتی و بەجەرگیی نیشان دا. ژنێك لەو تاریکی شەوەداو بەو سەرمایەو بەمناڵێکەوەو بە دووگیانی بەو ڕەشەباو سەرمایە ئارامی گرت.

بەڵێ ئەمە کورتەیەك بوو لە ژیانی ئەم ئافرەتە سەرناس و زیرەك و بەشەرم و بەحەیاو بەتوانایە. بەڕاستی نمونەی ژنێکی ڕاستگۆو بەباوەڕو لێهاتووبوو کە توانی زۆر بە جوانی ئارەزوی خۆی دەرببڕێ کە حەزدەکات ببێتە هاوسەری موسا. وەك وتمان جوان هەڵی سەنگاندبوو لەناخ و کردەوەی تێگەیشتبوو بۆیە هەڵیبژارد .

ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە سوکیی نییە کە ئافرەت بەشێوەیەکی شەرعی و سنوردار هاوسەر بۆ خۆی هەڵبژێرێت. هەزاران دروودو ڕەحمەت لەگیانی خێزانی بەوەفاو بەئەمەکی حەزرەتی موسا وە هەروەها لەمێردە بەئەمەك و بەهێزو ژیرەکەی کە خوای گەورە هەڵیبژاردو کردی بەپێغەمبەر بۆ سەرگەلی جولەکە.

(٩)



## (ماشـيطـة) قژداهێنـەری کـچـەکـەی فیرعـەون

کاتێك پێغەمبەر ﷺ شەوڕەوی کرد لەمەککەوە بۆ قودس و لەوێشـەوە بـۆ ئاسمان، وە جوبرائیل لە خزمەتیدابوو. پێغەمبەر ﷺ هەستی بەبۆنێکی زۆر خۆشکرد بـۆنێکی زۆر خـۆش هـات بەسـەریدا و زۆر بەخۆشـییەوە هـەڵی مـژی فـەرمووی بـە جوبرائیل: ئەم بۆنە خۆشـە چـییە؟ فـەرمووی: ئەمـە بـۆنی (ماشـیتە)و منالـەکانی و مێردەکەیەتی.

(لما أسری بالنبی شم ریحا طیبة فقال یاجبریل ما هذه الریح الطیبة قال هذه ریح قبر الماشیطة وأبنیها وزوجها )"أبن ماجة"

لەکاتێکدا ئاینی باوەڕداران بەخودا بلاّو بووبوویـەوە، وە شـوێن کـەوتوان و هەوادارانی ڕۆژ دوای ڕۆژ لەزۆر بووندابوون، فیرعەون ئەم دیاردەیە بووبوو بە مـەراقی شەوو ڕۆژی کە سەیری نەکرد وا شوێن کەوتوانی موسا ڕۆژ دوای ڕۆژ لەزۆر بوونـدایـە ترسی ئەوەی لێنیشت کە وا ئاینی موسا بالاّدەست بێت و ئاین و دەسە لاّتی فیرعـەون لەناوبـەرێت. لـە م بـیر کردنەوەیـەدا بـوو زۆر مشـەوەش بـوو بەبـەردەوامی لـە نـاو کۆشکەکەیدا نەهات و نە چوو لـەقینا جارجـار نەیکێشـا بەشـتەکانی دەورو بـەریا و شەڕی لێدەباری کەس نەیئەوێرا قسەی لەگەڵ بکات، بەردەوام بیری دەکـردەوە لـەوەی

چۆن وه چ فەرمانێ دەربكات كه شوێنكەوتوانی موسای پێ لەناو بەرێ وەرزگاری ببێ لەدەستیان. بڕیاری دا بنێرێ بەشوێن گەورەترین پیاوی ڕاوێژكاریا كەناوی (هامان) بوو كەوا چارەسەرێكی بۆ بدۆزێتەوه بۆ ڕێگاگرتن لەبلاوبوونەوەی دینی موسا و كەمكردنەوەی شوێنكەوتوانی. بەیەكەوه بڕیاریاندا كەوا هەركەس باوەڕ بەئاینی موسا بێنێت ئەوا بیگرن و بیخەنه زیندانەوه و ئەشكەنجەیان بدەن و ئازاریان بەن و دووریان بخەنەوه لە ئاینی موسا و بگەڕێنەوه بۆ سەرئاینی پێشویان كه باوەڕبوون بوو بە فەرمانی فیرعەون، فیرعەون هەموو كاربەدەستانی سەربەستكرد كەوا: بگەڕێن بەدوای شوێن كەوتوانی موسا مال بە مال و كۆلان بەكۆلا و شوێن بەشوێن بگەڕێن و بیانگرن و بیانبەن بۆكۆشكی فیرعەون و لەوێ ئازاریانبەنز كۆشكی فیرعەون وای لێهاتبوو بووبووه گۆڕستانی زیندووان. ئەوانەی كه باوەڕیان بەئاینی موسا هێناوه و بەخوای تاك و تەنهاو درو ستكەری ئاسمان و زەوی. هاوارو نركەو نالەو قیژەی فەقیرو هەژار و باوەڕداران كۆشكی فیرعەونی پڕكردبوو، بەجۆرێ ئازارنەدران كه بێباوەڕان خۆشیان نەفرەتیان لەو كردەوه قێزەونە دەكردەوه چونكه بەجۆرێ دەنگی نالەو لێدانی هەژاران و باوەڕداران ئەبیستر‌ا، تەنانەت دڵی بێباوەڕانیشی ئەهەژاند بەلام هیچیان پێنەئەكرا، باوەڕداران چیبكەن هیچیان لەدەسەلاتا نییه تەنها هاواریان بەرزدەكردەوه بۆلای خوای هەق سێن و تاكو تەنها و بەئارام. ئەم ئازارو لێدانه هەمووكەسێكی دەگرتەوه تەنانەت منالانیش، منالی شیره خۆرەش ئەو دڵ ڕەقانه هیچ بەزەیی و سۆزێكیان نەئەجۆشا. تا ئەبوو بەلاو ناڕەحەتی و نەهامەتی و دڕندەیی بەرامبەر باوەڕداران زیادی دەكردو ئەوانیش زیاتر پەنایان بۆلای خوای تاكو تەنهاو دەسەلات دار بەسەر هەموو بونەوەرو ئەوەی هەیه لە هەموو دنیادا دەبرد. ئەم ڕەفتاره وای كرد كەزۆربەی باوەڕداران وایان لێبێت لەترسی گیانی خۆیان بەپەنهان خواپەرستی بكەن و ئاشكرای نەكەن لەتاو زولم و زۆری بێ باوەڕان دەرهەقیان وه هەندێكی تریان پەنایان دەبرده بەر ڕاكردن و هەلاتن و خۆشاردنەوه، ئا

لەم کاتەدا لەناو کوشتن و بڕین و ئازاردانی باوەڕداران لەناو کۆشکی فیرعەونا بۆ ڕازاندنەوەی کچەکەی فیرعەون باشترین ژنیان هەڵبژارد کە ئەویش "ماشیتە"بوو کە ژنێکی باوەڕداربوو بەئاینی موسا، بەڵام بەپەنهان و بە نهێنی ڕۆژ تا ئێوارە لەناو کۆشکی فیرعەونا کچەکەی فیرعەونی جوان دەکردوو دەیڕازاندەوە وە لەدڵیشەوە خواپەرستی دەکردوو دەپاڕایەوە لەپەروەردگار کە ئاینی موسا سەرکەوێت بەسەر فیرعەونا. ماشیتە کۆمەڵێ منداڵی جوان و ئاقڵی هەبوو لەسایەی ئاینی خواو بەپەروەردەیەکی جوان پەروەردەی دەکردن و ئامۆژگاری دەکردن لەگەڵ مێردە هەژارەکەی کاریان دەکرد تا بژێوی ژیان دابین بکەن و منداڵەکانیان نەمرن لەبرسانا و بەخێویان بکەن. خۆی لەکۆشکی فیرعەون کاری جوانکاری بۆکچەکەی فیرعەون دەکرد. ڕۆژێکیان خەریکی شانەکردنی قژی کچەکەی فیرعەون بوو لەپڕ شانەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە ویستی هەڵی گرێتەوە لەوکاتەدا کەدانەوییەوە بۆسەر ئەرزەکە کە شانەکە هەڵگرێتەوە زۆر بە بێئاگا لەوەی کە کچەکەی فیرعەون گوێی لێیە وتی: (بسم الله الرحمن الرحيم) واتە: بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبانەوە. کچەکەی فیرعەون تا ئەو کاتە وشەو وتەی وا جوان و سەرنج ڕاکێشی نەبیستبوو بەرامبەر باوکی بوترێ زۆر بەدڵخۆشییەوە وتی: جوانە مەبەستت چییە لەو وشە جوان و ناوازانە مەبەستت باوکمە؟ ماشیتە زۆر ئازایانەو بوێرانە هەڵسایە سەرپێ و وتی: نەخێر مەبەستم باوکت نییە مەبەستم خوای تاك و تەنهایەو تەنها ئەو بەخوا ئەزانم و هیچ شتێك و هیچ کەسێکی تر غەیری ئەو بەخوا نازانم. ئەو خوایەی کە ناوم هێنا خوای منیش و خوای باوکیشتە کە ئەویش (الله)یە. کچە ڕقی هەڵساو تووڕە بوو لەماشیتە زۆر بەناشرینی هەڕەشەی لێکرد وتی: هەرئێستا ئەم هەواڵە ئەگەیەنمە باوکم مەگەر نازانی چیت لێبەسەردێنێ؟ بەڵام ماشیتەی باوەڕ لەبن نەهاتووی ئازاو بوێر بەهیچ شێوەیەك نەترساو گوێی پێنەیا سووربوو لەسەرقسەی خۆی. کچەکەی فیرعەون زۆر خێراو بەپەلە گەشتە لای باوکی و هەواڵەکەی پێگەیاند کەوا ژنێك لەناو

کۆشکەکەیا هەیەو نکۆڵی لەخوایەتی ئەو دەکات کڕنوش بۆ خوایەکی تر ئەبرێ لەکۆشکەکەیدا. فیرعەون کاتێ ئەم هەواڵەی بیست زۆر تورە بوو وای لێهات هیچ هۆشی لایخۆی نەما بەدەنگی بەرز هاواریئەکرد و ئەی قیران. بڕیاریدا ئەبێ سزایەکی قورسی خۆی و ماڵ و منالی بەم، ببێت بە عیبرەت بۆ هەموو خەڵك وە بیانکەم بە پەندو عیبرەت بۆ هەموو شوێنکەوتووانی موسا. بانگیکرد و زۆر بەزەبرو زەنگ و تورەیی هەڕەشەی لێکرد پێی وت: تۆ بیجگە لەمن خوایەکی تر شك ئەبەی؟ لێرا ماشیتەی پالەوان زۆر دلێرانەو زۆر باوەڕدارانە وتی: بەڵێ خوای من و خوای تۆش تەنها ئەوخوایەیە کە من کڕنوشی بۆ ئەبەم کە ئەویش (اللە )یە. فیرعەون کاتێ گوێی لەم وتانەی ماشیتەبوو بەتەواوەتی هۆش و عەقلی لای خۆی نەما هەروەکو شێت فەرمانی دا کە مەنجەڵێکی گەورە کە لەمس دروستکرابێت بیهێنن و ئاگرێکی بەهێز لەژێریا بکەنەوە تا مسەکە ئەتوێتەوە ئەمجا خۆی و مێردو منالەکانی و دایك و باوکی تێ فرێ یەن بسوتێن تادەبنە خۆڵەمێش. ماشیتەی باوەڕدامەزراو لێرەدا هیچ نەترسا لەئازاری فیرعەون و دڕندەیی فیرعەون بەلام یەك داوای هەبوو وتی: با خۆم و منالە ساواکەم بەیەکەوە بخەنە ناومەنجەلەکەوە تا پێکەوە بسوتێین و ئێسك و پروسکمان بەیەکەوە بسوتێ. ئەمەیە باوەڕو دلێری بەم شێوە باوەڕداران بەهەشت ئەبەنەوە و ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست دەهێنن، فیرعەونیش وتی: ئەمە داوایەکی ئاسانە بۆت جێبەجێدەکەین، مەنجەڵ هاتە جۆش و خرۆش مسەکە شل بوو هاتە کوڵ لەبەرچاوی خۆی و مێردەکەی یەك یەك منالە بێتاوانەکانی هەڵئەدرانەناو مەنجەڵەکەوە تا ئەسوتان، قیژەوهاواریان ئەرزو ئاسمانی پڕکردبوو پاشان میردەکەی و باوکیو دایکە پیرەکەشی سوتان بەهەمان شێوە خرانە ناومەنجەڵەکەو سوتان. ئەم دیمەنە دڕندانەیە چ دڵێك ئەتوانێ بەرگەی بگرێت کێ هەیە ئاوا ئارام بگرێت بێجگە لەماشیتەی باوەڕدار و خواناسی ڕاستەقینە. لەگەل ئەوەشدا دل و جەرگی قرچەی ئەهات وا سەرەش گەشتە سەرخۆی و کۆرپەلەکەی کە یەکجار خۆشی ئەویست لەتاوا

نەیئەزانی چیبکات هەر لەخوا ئەپاڕایەوە کە لەگوناھ و تاوانەکانی خۆشبێت، بەڵام شەیتان زۆر زۆرداره تا لەم کاتەدا ویستی زەفەر بەماشیتە بێنێت و وەسوەسەی خستە دڵیەوە و توشی دڵەڕاوکێی کرد، کە لەبەربەزەیی و سۆزی کۆرپەلەکەی پەشیمان ببێتەوە وا منداڵەکانی تری لەدەست چوو، جەرگی وەکو مەنجەڵەکە قوولپی ئەدا لەتاوا، بەڵام ماشیتە لەم کاتە ناسك و دژوارەدا کەوتیشە شەڕی شەیتان و وەسوەسەی زۆرەوە کە شەیتان ئەیخستە دڵیەوە هەر خۆڕاگریوو بەرەنگاری شەیتان ئەبوویەوە. نزیك بوو لەوەی شەیتان بێ ئارامی بکات و لاوازی بکات لەپێناو کۆرپەلە نازدارەکەی کە هیچ دەسەلاتێکی نەمابوو. تا لێرەدا خوای میهرەبان خوای بەئاگا لە هەموو کردەوەو هەست و نەستێك تەنانەت بەئاگا لەترپەی دڵەکان، فریای ماشیتە کەوت منداڵە جگەرگۆشەکەی کە تەمەنی لەچەند مانگێك کەمتر نەبوو هاتە گۆو بەدایکی جەرگ سووتاوی وت: ئەی دایکە خۆت بگرە و ئارامبە تۆ لەسەر هەق و ڕاستیت. یەکسەر بەئاگاهاتەوە زۆر لەخواپاڕایەوە ئنجا سەرەیان گەشت یەکسەرفڕێیان دانە ناو مەنجەڵەکەوە لەگەڵ کۆرپەلەکەیا تا سوتان ومردن هەر ئەپاڕایەوە کە خوای گەورە باوەڕکەی لێ وەربگرێت و لێی خۆش ببێت .

بەڕاستی ئەمەیە ئاین پەروەری و باوەڕی پتەوو دامەزراو کەخۆی و ماڵ و منالی بەخشییە تەنها وشەیەك کە ئەویش (الله) بوو چونکە زۆر جوان خوای ناسی بوو زۆری خۆشئەوویست ئومێدی باشی بەڕۆژی دوایی هەبوو دونیای لا گرنگ نەبوو دەیزانی دونیا هەرتەواو ئەبێت بەڵێ خۆی و کۆرپەلەو منالەکانی و دایك و باوك و مێردەکەی گیانیان سپاردەی پەروەردگاربوویەوە، گەشتن بەوبەهەشتەی کە خوای پەروەردگار بەڵێنی داوە بیبەخشێت بەباوەڕداران بەڕاستی. زۆر جوان شەهید بوون لەپێناو ئاینی خوادا. هەزاران درودو ڕەحمەت بۆگیانی پیرۆزی ماشیتەو منال و خێزانی وە ئە وبۆن و بەرامەی سوتان و هەڵقرچانەی ئەوان و دڵی دایکە

بەستەزمانەکەیان بوویە بۆنێکی خۆش و دڵڕفێن لەبەهەشتا بۆهەتاهەتایی، وە ئەو بۆنەیە لەکاتی شەو ڕەویدا پێشکەش بەپێغەمبەری ئازیز کرا ﷺ .

وە زۆرێك لەزانایان ئەڵێن باوك و دایکی خۆی و مێردەکەشی بەهەمان شێوەی ئەوان سووتان لەوکاتەدا. خوای میهرەبان ئێمەش ببەخشێ لەبەر خاتری ئەوان.

(١٠)



## حەزرەتی مەریەم دایکی عیسا (علیه السلام) کچی عیمران

خوای میهرەبان جبرئیلی نارد بۆلای وە پـێی وت: ئـەی مەریـەم خـوا تۆی بەرزو بڵند کردووەو هەڵی بژاردویت و خاوێن و بێگەردی کردویت تۆی بەرزو بڵند کردوە لەناو ژنانی جیهانـدا:﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّـــرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاء الْعَالَمِينَ ﴾آل عمران:٤٢. وە پێغەمبەر ئەفەرمووێ:(باشترین و بەرێزترین ژنان لەناو ژنانی هەموو جیهان(مەریەم و ئاسیاو خەدیجەو فاتیمە)ن.

لەناو ژیانێکی نائارامی و دڵەڕاوکێ و پڕلەجەنجاڵی و بێزاری لەناو بەنو ئیسرائیل دا ژیانیان ئەگوزەران، چونکە ئاینەکەیان پڕبوو لە درۆو ناڕاستیو بەدەستکاریکردنی لەلایەن زۆرداران و فەرمانڕەوایی ئەوکاتە دینەکەیان بەتەواوی پوچەڵ بووبوویەوە. هیچ جۆرە ماف و ئەمان و سیقەیەك نەبوو لەنێوانیانداو هەریەکە بۆ خۆی دژایەتی ئەوی تری ئەکردو دەسەڵاتدار بێدەسەڵاتی ئەچەوسانەوە و مافی زەوت دەکرد. ئا لەم کاتەدا کە دونیا پڕبوو لە خەشم و قین و درۆ و کوشتار (عیمرانی کوڕی ماتان و خێزانەکەی کە ناوی حەنەی کچی فاقود بوو ) ئەم ژن و پیاوە بەتەنها مابوونەوە لەسەر خواپەرستی و دادوەری و ڕاستگۆیی و تەنها کڕنوش بردنیان بۆ پەروەردگاری ڕاستەقینە بوو بێنەوەی هاوەڵی تری بۆ پەیدا بکەن سەرەڕای ژیانیان

لەناو ئەو هەموو بێباوەڕو نەفامانە،ئەم دوو باوەڕدارە منالّیان نەئەبوو منالّێك كە بێتاقەتی و خەمیی خۆیانی پێدەركەن و بیكەنە هاوەلّ وهاودەمی خۆیان و ببێتە ڕوناكی چاوانیان..

ڕۆژێك حەنەی دایكی مەریەم لەبن درەختێكا دانیشتبوو سەیری كرد چۆلەكەیەك خواردن ئەدا بە بێچووەكەی، بێچوەش زۆر بەپەرۆشەوە خواردنەكەی ئەگرتەوەو ئەیخوارد. حەنەش كە ئەمەی بینی سۆزی منالّ هات بە دلّیا و زۆر ئاواتەخواز بوو خوا منالّێكی پیّ ببەخشێت نزای كرد لە خوای گەورە كە خوای گەورە منالّێكی پیّ ببەخشێت و لە سۆزی دایكایەتی بێبەش نەبێت وە بیكاتە نەزر كە خزمەتی (بیت المقدس )ی پیێبكات .

﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّراً فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾آل عمران:٣٥، خواوەندی بەخشندە و زانا بەهەموو شتیّ نزاكەی لێوەرگرت بەلاّم حیكمەتی خوا ئەوەی پێی بەخشی لەمنالّ كچ بوو كوڕ نەبوو زۆری پێناخۆش بوو وە پێناخۆش بوونەكەشی لەبەر ئەوەبوو نەزری كردبوو كە خزمەتی بەیتی پیێبكات، بەلاّم ئەو خزمەتە بەكوڕ دەكریّ نەك بەكچ. خۆ هیچیان لەلای پەروەردگار بێڕێزترنین هەردووكیان بەرێزن وەكو باسمان كرد پیّ ناخۆش بوونەكەشی هەر لەبەرئەوە بوو كە ئەوخزمەتەی بەكور دەكری بەكچ ناكری وتی: پەروەردگارە ئەوا من ناوم نا مەریەم خۆی و نەوەكانی ئەسپێرم بەتۆ بەدووربن لە فێلّ و فڕی شەیتانی نەفرەت لێكراو فەرمووی:﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى وَاللّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وِإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ آل عمران:٣٦. ئەلێن هەموو مرۆڤێك كە لە دایك دەبێت شەیتان دەستی لێئەدا بێجگە لە مەریەم و كوڕەكەی نەبیّ(موسلیم)، ویستی خوا وا بوو كە مەریەم بێباوك بێت، باوكی مرد هێشتا مەریەم منالّ بوو بەو منالّییە

دایکی لەسەر نەزرەکەی خۆی سوربوو بردی بۆ(بیت المقدس) دەستی کرد بە پارانەوە و نزا کە خوای گەورە لێی وەرگرێ، خواش بە میهرەبانی خۆی نزاکەی بە جوانترین شێوە لێوەرگرت .

بە پاکی و بێگەردی و زۆر بە جوانی مەریەمی پەروەردەکرد:﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتاً حَسَناً وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَـذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ إنَّ اللّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾آل عمران:٣٧. ئەحبارەکان بینیان خۆشەویستی زۆریان بۆ مریەم لا دروست بوو، بەفەرمانی خوا مشتومڕ کەوتە نێوانیان هەریەکە ئەیووت من سەرپەرشتی دەکەم، بەلاّم حەزرەتی زەکەریا وتی: من سەرپەرشتی دەکەم چونکە لە هەمووان بەتەمەنترم و ژنەکەم پووریەتی کەوابوو من لە هەمووتان لەبەر ترم بۆ سەر پەرشتی کردنی بەلاّ ئەحبارەکان ڕازی نەبوون بەو بڕیارەی زەکەریا، بەلاّم زەکەریا وتی: با شتێك بکەین تا ئەم مەسەلەیە نەبێتە مایەی ناخۆشی نێوانمان ئەویش ئەوەیە هەرکەسەو ئەوقەڵەمانەی کە تەوراتی پێ ئەنوسێتەوە هەرکەسەو قەڵەمەکەی خۆی بێنێت هەموومان ئەیخەینە ناو ڕووباری (ئوردن)ەوە، قەڵەمی هەرکامان وەستا ئەوا مافی ئەوەمانە سەرپەرشتی بکەین کاتێ ئەوکارە کرا قەڵەمی هەموویان ئاو بردی یا کەوتە ژێر ئاوەوە تەنها قەڵەمەکەی زەکەریا نەبێت. ئەوەبوو سەرپەرشتیاریکردنی مەریەم کەوتە ژێر دەستی زەکەریا.

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُون أَقْلاَمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ آل عمران:٤٤. لەوکاتەدا مەریەم گەشتە دەستی زەکەریا لە ساڵێ زیاتر نەبوو حەزرەتی زەکەریا سەرپەرشتی دەکردو خزمەتی کرد لەناو میحرابەکەدا تا گەورە بوو هیچ کاتێ زەکەریا نەئەچوو سەردانی مەریەم بکات تا ئیزنی لێ نەخواستایە و

سلاّوی لێنەکردایە، بەمەبەستی خواردن و خواردنەوە سەردانی دەکرد. بەلاّم هەرچەند دەچووە لای سەیری دەکرد سەبەتەیەکی‌میوەی پڕ لە میوەی جۆراو جۆری لا دانراوە، زەکەریا زۆ سەری سوڕما، چونکە لەمیوەی زستان و هاوین و هەرچوار وەرزەکەی تیایە. خۆی پێ نەگیرا و وتی: ئەی مەریەم ئەم میوانەت لە کوێ بوو؟ ئەویش وەلاّمی دایەوە وتی: ئەمە ڕزق و ڕۆزییەکە لەلایەن خواوە بۆم هاتووە:﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتاً حَسَناً وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَـذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ إنَّ اللّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾آل عمران:٣٧. بەڵێ خوای بەخشندە مەیلی لە هەرکەسێ بێ پێی ئەبەخشێ، کاتی زەکەریا ئەم بەخشندەیی‌یە و دەسەلاّتە بێ سنورەی پەروەردگاری بینی زۆر ئارەزووی منالّی کرد خوای گەورە منالّێکی پێ ببەخشێت و ئەویش خزمەتی بەیتی پیّبکات، زۆر پاڕایەوە لە پەروەردگار کە خوای گەورە منالّێکی پێ ببەخشێت کە یارمەتی بدات لەکاروباری بەیتا، چونکە ئەم وا خەریکە هیزی نامێنێ و پیربووە. ئەویش لە میحرابا بوو لەکاتی خواپەرستیدا خوای گەورە بەهۆی جبرائیلەوە موژدەی پێدا و فەرمووی: خوا کوڕێکی صالح و گوێڕایەڵت پێ دەبەخشێت بەناوی یەحیاوە دەبێتە خاوەن پلەو پایەیەکی بڵندو خۆپارێز لە گوناهان وە دەیکەینە پێغەمبەرو لە پیاوە باشە کانە :﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاء فَنَادَتْهُ الْمَلآئِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَـى مُصَدِّقاً بِكَلِمَةٍ مِّنَ اللّهِ وَسَيِّداً وَحَصُوراً وَنَبِيّاً مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾ آل عمران:٣٨-٣٩

ساڵ هات و ڕۆشت زەکەریا تەمەنی زۆربوو پیرو لاوازبوو نەی ئەتوانی خزمەتی مەریەم و (بيت المقدس) بکا وەك جاران. گەڕا بەنێو بەنو ئیسرائیلدا داوای لێکردن کەوا یەکێکی شایستە خزمەتی مەریەم بکاو سەرپەرشتی بکات، پیاوێکی لە

خواترس و پاك و بەرێزیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی چاودێری مەریەم بكا بەناوی (یوسفی نەجار)كە كوڕی خاڵی مەریەم بوو خواپەرستێكی پاك و باوەڕێكی باشی هەبوو بەخوای تاك و تەنیا. یوسفی نەجار خزمەتێكی باشی مەریەمی كرد تا گەورەبوو گەشتە تەمەنی هەرزەكاریی. ئەڵێن ڕۆژێك خواردنی لێدەبڕێ بۆ ئەو مەبەستە عەبا ئەدات بەسەریداو دەچێتە دەرەوە بۆ پەیداكردنی پێداویستی خۆی و خواردن لەتەنیشت ئەو دیوارەی كە كرابوو بەحەصار، چونكە كارەكە ویستی خوایە ئەبێ ئەو دەورانە ببینێ، پاشان دووركەوتەوە لە خەڵكەكە بەشێوەیەك نەكەس ئەویان ئەبینی و نەئەویش كەسی ئەبینی بۆ ئەوەی بەسۆزەوە خواپەرستی بكات: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَاناً شَرْقِيّاً فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَاباً فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيّاً﴾ مريم:١٦-١٧. لەكاتیكدا مەریەم خەریك بوو بەكاری نوێژ و خواپەرستی‌یەوە، جوبرائیل بەفەرمانی خودا لە شێوەی پیاوێكی نورانی و ڕوخۆش هات بۆلای و مژدەی حەزرەتی عیسای پێگەیاند:﴿فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَاباً فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيّاً ﴾مريم:١٧. مەریەم ترساو هاواری كرد وتی: پەنائەگرم بەخوا ئەگەر تۆ پیاوێكی خواپەرست بیت جبرەئیل پێی وت: مەترسە من نێرراوم بۆ لای تۆ خوا بەخشی بەتۆ كوڕێكی زیرەك و هۆشمەند مەریەم وتی: من كچم هێشتا شووم نەكردووە چۆن منالّم ئەبێت وە هیچ كەسیش تا ئێستا نەیتوانیوە توخنم بكەوێت. جبرائیل پێی فەرموو: خواش وای ئەوێت كە تۆ بەو شێوەیە منالّت ببێت بۆ ئەوەی ببیتە بەڵگەی تەواو و نیشانەی دەسەلاّت و توانای خوا وە میهرەبانییەكی خوایشە هەرئەبێت ببێت:﴿قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّاً قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَاماً زَكِيّاً قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيّاً قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْراً مَّقْضِيّاً﴾مريم:١٨-٢٠ ئەوانەی كە تەفسیری ئەم ئایەتەیان

کردووه ئەڵێن: (کاتیَ مەریەم چوه دەرەوه و سەرپۆشەکەی دا بەدەم و چاویدا لەوکاتەدا جبرەئیل فوی کرد بەملوانی کراسەکەیدا، نیشانەی حەملی لیَ پەیدابوو سکی گەورەبوو وای لێهات وەختی منالَ بوونی بێت، ئەویش لەترس و لەشەرما لەگەلەکەی دوورکەوتەوه بەخێرایی ڕوەو خۆرهەلاَت لای شیوێك کە شوانەکان بۆی ئەچون، کاتی درەنگ کەوت گەلەکەی شوێنی کەوتن بۆ ئەوەی بیدۆزنەوه چونکە هیچ کەس خەبەری نەئەزانی لەبارەیەوه .

مەریەم ڕۆشت تاتوشی دارخورمایەکی وشك بوو پشتی پێوه نا دەستی کرده گریان وتی: خۆزگە ئێستا بمردمایە پێش ئەوەی ئەم کارەم بەسەر بهاتایە ﴿فَأَجَاءهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْياً مَّنسِيّاً﴾مریم:٢٣. بەلیَ ژان گرتی و پالی دا بەبنی دارخورما وشکەکەوەو منالەکەی بوو، بەبیَ کەس و بەبیَ مامان و بیَ ئاو و خواردن. زۆر بەدلتەنگییەوه و بەعاجزی لەدۆلێکی وشکی بێئاوی چۆلدا منالەکەی بوو، بەلاَم خوای گەورە خۆی فەرمانی کردووه ئەبیَ ئەم کارەبیَ وه هەرخۆیشی فریای دەکەوێت و فریادرەسە، ویستی ئەو خانمە بەستەزمانە باوەڕداره بحەوێنێتەوه جوبرەئیلی بۆ نارد و بانگی لێکرد: دلت تەنگ نەبێت و مەترسە خوا جۆگە ئاوێکی بۆ هەلقولاندوی و لەئاوەکەی بخۆرەوه لقی ئەو دارخورمایەش ڕاتەکێنە خورمای تازەو نەرم و شلی پێوەیە. دەستی بۆ ڕاکێشە بەبیَ نارەحەتی لیَی بخۆو تا بەرچاوت ڕووناکی بۆ دێت و ئارامی و حەوانەوەت بۆ دێت ئەگەر هەرکەسێك لەگەلەکەت پرسیاریان لێکردی بلیَ بەرۆژووم و قسە ناکەم پرسیار لە منالەکەم کەن:﴿فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيّاً وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَباً جَنِيّاً فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْناً فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَداً فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْماً فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيّاً ﴾مریم:٢٤-٢٦ مەریەم بەم هەوالەی کەجبرەئیل کەلەلایەن خواوه پیَی درا

دڵخۆش بوو ئارامی بۆ هات، هەستا و منداڵەکەی گرتە باوەشی و بەرەو گەلەکەی کەوتە ڕێ کاتێ گەلەکەی ئەم دیمەنەیان بینی لەمەریەم سەریان سوڕما و پێیان وت: ئەمە چیە و چیت کردووە؟ بەڕاستی کارێکی ناشرین و نابەجێت کردووە هەرگیز ئەمەمان لەتۆ چاوەڕوان نەئەکرد ئەی خوشکی هارون نە باوکت داوێن پیسبووە نە دایکت داوێن پیسبووە. زۆر ئیهانەیان کرد بەڵام مەریەم وەڵامی نەدانەوە ئیشارەتی بۆ کردن وتی: من بەڕۆژووم پرسیار لەمنداڵەکەم بکەن ئەو وەڵامتان دەداتەوە، ئەوانیش زیاتر کەوتنە گومانەوە و ڕقیان هەسا و تووڕەبوون وایان ئەزانی گاڵتەیان پێ ئەکاو وتیان: چۆن منداڵێکی ئاوا تازەبوو قسەئەکا ﴿فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئاً فَرِيّاً يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيّاً فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيّاً﴾مریم:٢٧-٢٩

خوای گەورە مرۆڤی باوەردارو ڕاستگۆ پشت گوێ ناخات ئەوەتا خوای گەورە تواناو دەستەڵاتی خۆی چۆن ئەنوێنێ منداڵی تازە لەدایك بوو چۆن بەزمانێکی پاراو و ڕوون قسە ئەکات، عیسا وتی: من یەکێکم لەبەندەکانی خواو خوا کتێبم بۆ ئەنێرێ و وە دەمکاتە پێغەمبەر، پیرۆزوسەربڵندم دەکات لەهەرکوێ ببم خوا فەرمانم پێ ئەکات بەوەی کە نوێژەکانم بکەم و زەکات بدەم و تا لەگیاندا دەمێنم وە چاکەبکەم و چاکبم لەگەڵ دایکمدا وە من سەرکەش و زۆردارنەبم سڵاوی خوام لەسەربێت لەو ڕۆژەی لەدایك بووم وە لەو ڕۆژەی دەمرم و لەوڕۆژەی زیندوو دەکرێمەوە بەڕوونی و ئاشکرا پاکی و داوێن پاکی مەریەم دەرکەوت بۆ بێباوەڕان: ﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيّاً وَجَعَلَنِي مُبَارَكاً أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيّاً وَبَرّاً بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّاراً شَقِيّاً وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيّاً ذَلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ مَا

كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَانَهُ إِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴾
(مريم : ٣٠-٣٥)

بەڵێ کاتێ گەلەکەی بەتایبەت ئەوانەی ملهوڕ و بێباوەڕبوون لەم ڕووداوە هەموویان سەریان سوڕما و ترس و لەرز دایگرتن هەموو لەخەفەت و لەترسا دەمو چاویان گۆڕاو سورهەڵگەڕا و تێکچوون هەموو ڕایانکرد وە خوایش کردیە باشترین بەڵگە بۆ پاکێتی دایکی عیسا (درودو سەلامی خوایان لەسەربێت). مەریەم دڵی ئارام بوویەوە هۆشی هاتەوە و سوپاسی خوایکرد بۆ ئەو هەموو نازونیعمەتەی کە خوا پێی بەخشی، بەلاّم دوژمنانی خوا ترسی ئەوەیان بوو کە گەورەببێ و کۆشك و دەسەلاّتیان لێ داگیربکات و ئەوان دەربەدەرو سەرگەردان و مل شۆڕبن پاشاکەیان سەربازەکانی نارد بۆئەوەی ئەو منالّە پیرۆزە بکوژن، مەریەم لەترسی منالّەکەی کۆچی کرد لەگەڵ کۆرپەلەشیرەخۆرەکەی و یوسفی نەجاریش لەگەڵیاندا بۆ ولاّتی میسر. لەوێ مانەوە نزیکەی (١٢)ساڵ ، دایکی پەروەردەی کردو خزمەتی کرد بەجوانترین پەروەردە پاش (١٢)ساڵ بەبیستنی مردنی ئەو پاشا زۆرداره دڵ ڕەقە گەڕانەوە بۆ فەلەستین نیشتەجێ بوون لەشاری (الناصرە)، لەوێ مانەوە تا حەزرەتی عیسا تەمەنی گەشتە (٣٠)ساڵ خوای پەروەردگار پەیامی بۆ نارد کە تەورات بوو کردیە پێغەمبەر .

دایکی یارمەتییەکی باش و دڵسۆزانەی ئەدا لەپێناوی زیادکردنی ژمارەی باوەڕداران وە هەروەها ڕووبەڕووی زۆر نەهامەتی و زولّم وزۆری جولەکەکان دەبوویەوە کە ئەیان ویست بەبەردەوامی کوڕە پێغەمبەرەکەی لەناو بەرن فێڵ و تەڵەکەی زۆریان بۆ دائەنا بەمەبەستی لەناوبردنی .

ڕۆژێ کۆمەڵێ سەرباز زۆر دڕندانە هاتن بۆ کوشتنی. دەوری ئەو شوێنەیان دا کە حەزرەتی عیسای تیابوو چوونە ژوورەوە بۆئەوەی بیکوژن و لەخاچی بەن، بەلاّم خوای بەدەستەلاّت و توانا ڕزگاری کرد لەدەستی ئەوان و بەرزی کردەوە بۆ بارەگاکەی

خۆی، یەکێ لەو سەربازانە چووە ژوورەوە بۆگرتنی حەزرەتی عیسا، خوای گەورە شێوەی عیسای کرد بەبەریا کە هاتە دەرەوە وایان زانی ئەوە، یەکسەر گرتیان و لەخاچیاندا بەزیندوویی، ناوی (یەهوزا)بوو لەخۆشیا نەیان ئەزانی چیبکەن وتیان: تەواو نەجاتمان بوو لەخاچماندا. تا ئیستاش دەڵێن: لەخاچدراوە، سەلیبیان کردووە بەنیشانەی لەسێدارەدانی ئەو کە شتێکی زۆر دوورە لەڕاستییەوە، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ:نە کوژراوەو نە لەسێدارە دراوە بەڵکو خوای گەورە شێوەی عیسای کرد بەبەری یەکێك لەبێباوەڕان و عیسای بەرزکردەوە بولای خۆی:﴿وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِيناً﴾ النساء:١٥٧

دایکی دڵپاك خزمەتکاری (بیت المقدس) و دایکی پێغەمبەر عیسا (هەزاردرودو رەحمەت لەخۆی و هاوڕێیازانی)، مەریەم وەفاتی کرد پاش (٥)ساڵ لەدوای ئەوەی کە خوای گەورە عیسای بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان وە گۆڕەکەی (لەزەوی دیمەشقە). ئەمەبوو چیرۆکی خاتونی بەڕێز و سەروەر خاتونێکی باوەڕدارو ڕاستگۆ و بەئارام. خوای گەورە لەقورئانا بۆمان دەگێڕێتەوە بێگومان هیچ کات چیرۆکێ لەقورئانا باس بکرێ دوورە لە گومان و درۆ چونکە بێباوەڕان هەرگیز کۆڵنادەن لە دژایەتی کردنی ئاینە ئاسمانییەکان. هەرکات و هەر زەمانەیەك بەشێوەیەك بەرەنگاری دەوەستن و بوهتان و درۆ بۆ مەریەمی داوێن پاك دروست دەکەن. یەکێ لەو درۆیانە ئەڵێن عیسا کوڕی خوایە یان کوژراوە کڕنوش و عیبادەتیان بۆئەوەر دەپەرستن، وە یان دەڵێن مەریەم کچی خوایە و دەیپەرستن بێگومان هەموو ئەمانە هەڵبەستراو و درۆیە. دروستکراوی دوژمنانی دینە چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: (ویکفرهم وقولهم علی مریم بهتانا عظیما)

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێ: عیسا ناتوانی هیچ شتیك بكات نە خۆی نە دایكیشی هەردووكیان بەندەی خوان ئەوان بەندایەتی بۆ خوا ئەكەن و خۆیان بەعەبدی خوا ئەزانن كەچی بیباوەڕان و سەرلێشێواوان بۆ ناشرین كردنی دین ئەڵێن: عیسا كوڕی خوایە یان ئەڵێن عیسا خۆی خوایە یان دایكی، واتە مەریەم خوایە بەدڵنیاییەوە ئەوەی ئەم قسانە بكاو باوەڕی پێیان هەبێ كافرو بیباوەڕە بەر نەفرەتی خوا دەكەون، وە خوای گەورە دەفەرموێ: ئەگەر بەوێت مەریەم و عیسای كوڕیشی ئەوەیشی لەزەویدایە لەناوی دەبەم كێ هەیە ڕێگری لەم كارە بكات و دەسەڵاتی هەبێ بەسەر ئەم كارەدا بێجگە لە خوای تاك و تەنها: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَآلُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللّهِ شَيْئاً إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الأَرْضِ جَمِيعاً وَلِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ المائدة:١٧، وە هەروەها لەوبارەیەوە پەروەردگار دەفەرموێ: عیساش یەكێكە لەپێغەمبەرانی خوا تەنها ڕەوانە كراوە لەلایەن خواوە و هەڵبژێردراوە لەلایەن خواوە، هەروەها چۆن پێش ئەویش پیغەمبەران بووە و وە دایكیشی ڕاستگۆو بەوەفابووە وە هیچ كام لەوان خوانین چونكە ئەوان خواردن ئەخۆن و پێداویستیان بەخواردنەو بۆئەوەی پیی بژین. سەیركە چۆن بۆیان ڕون دەكەینەوە بەبەڵگەو نیشانەی ئاشكرا، و دیار تر سەیركە چۆن بوهتان و درۆ هەڵئەبەستن بەدەم خواوە؟ ﴿مَّا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلاَنِ الطَّعَامَ انظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ الآيَاتِ ثُمَّ انظُرْ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾المائدة:٧٥. بۆ ڕاستی ئەمەش خوا لەقایامەتدا دەفەرموێت: ئەی عیسای كوڕی مەریەم ئایا ئەوە تۆ وتوتە بەوخەڵكە كە منیش و دایكیشم بەدووخوا دابنێن لەخوار خوای پەروەردگارەوە؟ عیسا لەوەڵامدا دەفەرموێت: ئەی پەروەردگارا پاكی و بێگەردیو بێ هاوەڵی شایستەی تۆیە من بۆم نییە شتێكی لەو جۆرە بڵێم كە مافی من نەبێت و

چۆن حەق بەخۆم بدەم کە شتی وا بەزمانمدا بێت ئەگەر شتی واشم وتبێت خۆت زانایت بەهەموو شتێك وە هیچ شتێك لەتۆ شاراوە نی‌یە وە ئاگاداری بەهەرشتێك لەدلاَندا هەبێت وە خۆت چاك دەزانی من هیچ شتێکم پێ نەوتوون جگە لەوەی کە تۆ فەرمانت پێ داووم ئەویش ئەوەیە: تەنها تۆ بپەرستم خوای من و خوای ئەوان. من شایەتم بەسەریانەوە هەتا لەدونیادا لەناویاندا بم کە مردیشم خۆت چاودێرو ئاگاداربوویت لێیان. هەرتۆی شایستەی ئەوەی شایەت بیت بەسەر هەموو شتێکەوە:﴿وَإِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـهَيْنِ مِن دُونِ اللّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيداً مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾المائدة:١١٦-١١٧

# پێرست